ڕەسوڵ ڕەش ئەحمەدی

# خەزینەی بزە

کوپەی یەکەم



ڕەسول ڕەش ئەحمەدی

# خەزینەی بزە

کۆپی یەکەم

| | |
|---|---|
| سرشناسه | رش احمد، رسول |
| عنوان و نام پدیدآور | خه زینه‌ی بزه/ ره سوول ره ش ئه حمه دی. |
| . مشخصات نشر | سنندج: انتشارات علمی کالج، ۱۳۹۲. |
| مشخصات ظاهری | ۱۴۲ ص. |
| شابک | ۹۷۸-۶۰۰-۵۸۲۷-۸۳-۵ |
| وضعیت فهرست نویسی | فیپا |
| یادداشت | کردی. |
| موضوع | طنز کردی -- ایران -- قرن ۱۴ |
| رده بندی کنگره | PIR ۳۲۵۶ / س ۷۴۷ ر ۵۳ ۱۳۹۲ |
| رده بندی دیویی | ۸ فا ۹/ ۲۷ |
| شماره کتابشناسی ملی | ۳۱۳۸۸۸۲ |

انتشارات علمی کالج

نووسەر: ڕەسووڵ ڕەش ئەحمەدی

پە خشانگا: پەخشانگای زانستیی کالێج. / بەڕێوبەر: کەیومەرس کەرباسی

پیتچنینی لاپەڕەکان: وریا دیوانی / طراحی جلد: شاهۆ ئەحمەدی

ساڵی لە چاپدان: چاپی یەکەم-۱۳۹۲ / ئـەژمـار: ۲۰۰۰ بەرگ

نـرخ : ۷۰۰۰ تمەن





مرکز پخش: سنندج، خ پاسداران، مجتمع تجاری کردستان، طبقه همکف، واحد ۱۶۱و ۱۶۲

تلفن: ۳۲۹۱۰۸۶ - ۳۳۳۷۲۳۷ ۰۸۷۱ فکس: ۳۳۳۵۷۹۶ ۰۸۷۱

email: info@cspub.ir

به ناوی یار

## پێشەکی

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە دنیا و تەمەددون و شارستانییەت و... بیدەینە بەر پێوانە و بە تەرازووی فام هەڵیسەنگێنین هەموو تەمەددون و پێشکەوتنی کۆمەڵگای بەشەر لە سەرەتای بەدیهاتنڕا لایەک و ئەو سەت ساڵەی دوایش لایەک، دەو سەت ساڵەدا بوو کارەبا و ماشێن و کامپیۆتێر و فاکس و ئەو بەرەو بەر گۆڕانکارییەکی ئەوتۆیان بە سەر دنیا هێنا کە ئەو سەری ناپەیدایە؛ زۆر شتی تازە و نوێ هاتە گۆڕێ و زور شتی کۆن ڕەپاڵ نران و خرانە گۆڕێ.

پیشە، هاموشۆ، داب و نەریت، تەنانەت هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ئادەمیزاد تووشی گۆڕان بوون، ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەو دوو قۆناغە دە بەراورددا دەبینین قۆناغی دووهەم لە بەر مەودای کورتی زەمانییەوە وەک برووسکە تیژ هات و زۆر شتی وە بن خۆی دا. ئینسانی ئەوڕۆیی هەرچەند لە باری عیلم و تیکنیک و زۆر شتی دی بۆ بەراورد کردن دەگەڵ نەسلەکانی پێش خۆی نابێ، بەلام دەبێ ئەوەی قبوول کەین و بە خۆمانی بسەلمێنین کە نەسلی ئەوڕۆیی درووستە دە خانووبەرەی خۆش و بە سواری ماشێنی ئاخر مۆدێل و دمو پەڕی هەبوونی ئیمکاناتدا ژیان دەباتە سەر و هەرکەس چوارچێوە و قولەبەهەشتێکی بۆ خۆی ساز و بڕ داوە و بە سەر زۆر لایەنی تەبیعەت و سروشتدا زاڵ بووە بەلام سەرەڕای ئەو هەموو دەسهاتانە دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئینسانی ئەوڕۆیی چت‌گەلێکی وەک دلارامی و حەسانەوە و ئاسایشی لە کیس داوە،

هەوڵ بە دوای هەوڵ، وچان نادا. شان و پیل دەکوتێ و بە دوای شتێکدا هەڵوەدایە کە هەرگیز نایگاتێ و ئەو خۆشییانەی لێی بزر بووە هەرچی دەکا بۆی نادۆزرێتەوە و گەلێک جار بۆ گەیشتن بەو حەسانەوە خەیاڵییە زۆر بایخی ڕەسەنی کۆمەڵایەتی وە بن پێی خۆی داوە. دیارە ئێمە ئەو موویەمان دە ئاشدا سپی نەکردووە و دەوەندە تەمەنەی خۆماندا هەزاران سەرمان دیتوون چوونە ژێر خاک و دوای چێژتنی دنیایەک تاڵی و سوێری ئەو سەرسەرایەیان بەجێهێشتووە.

خۆش یا ناخۆش، ئێمە کەوتووینە نێوان ئەو دوو نەسلە؛ ڕەنگە لە زۆر بارانەوە وەک لە جەهەننەم ڕاگوێزرابینەوە بەهەشت، بەڵام شاهیدی زۆر شێوە ئاکار و ڕەفتارین کە دە ڕەی تاقەتماندا ناگونجێن. ئەوانە هەمووی بە جێی خۆی، با بێمە سەر هۆی نووسینی ئەم بابەتە.

لەبەر نەبوونی دەرفەتی چاپ ئەو قسەی بەهۆی ناچاری دە زۆر جێیاندا دووپات دەکەمەوە: بەرلەوەی سەر و سەکوتی تلەویزیۆن و ساتەلایت لە وڵاتی ئێمە و دە ماڵاندا قووت ببنەوە شەوانە پیاوانی گەڕەک لێک کۆ دەبوونەوە و بە شتێکی خۆماڵی شەویان شەق دەکرد، یەک حەکایەتی دەزانی، یەک بەیتبێژ بوو، یەک مەشرەفخۆش و خۆشڕاوێژ بوو، ئیواش بوو دەتکووت عەمباری درۆیانە. زۆر جار کە تووشی بیستنی قسەی والە بووباین، دەمانکوت: «فلانەکەس ئەمشەو هێندەی درۆ کرد لەوانەیە سبەینێ گەزێک بەفر بباریێ.» گرینگ ئەوە بوو منداڵ بە تەمەنی کەمی خۆیەوە قسەناس بوو و دەیزانی دە نێو ئەو شتانەیدا دەیانبیسێ کامی ڕاست و کامی درۆیە و وەک ئەوڕۆ دۆ و دۆشاو لێک نەدرابوو.

بەڵام کاتێ کوتوپڕ سەر و سەکوتی تلەویزیۆن قوت بۆوە، بەداخەوە ئێمە نەبووینە خاوەنی تلەویزیۆنێکی سەربەخۆ تا دە بواری خزمەت بە فەرهەنگی خۆماڵیدا بێ و لێزانان قۆڵی هیممەتی تێدا هەڵماڵن. بە جارێ ئەو کۆڕ و دانیشتنانە لە بەرێک

هەڵوەشان و سندووقی جادوویی بوو بە گوڵی مەجلیسی ماڵان و هێرشی فەرهەنگی دەستی پێکرد و قسەزانان قڕوقەپ و خانەنشین کران و بە هۆی دووپات نەکردنەوە ئەوەی دەیانزانی لە بیریان چۆوە. کاتێ لە تەمەنی بیستساڵی ئەو بڕوایەم تێدا پتەو بوو، کەوتمە بیری ئەوە بە هەر جوری بۆم بکرێ لە قەدەر توانایی خۆم بەرگری لە فەوتانی ئەو قسە خۆشانە بکەم.

وشەکان دەبوونییەتی خۆیاندا تاک و تەران بەڵام کاتێ بە زەوقی شاعیرێکی بەتوانا دەکەونە پاڵ یەکەوە وەک کۆمەڵێکی لێک‌گرێدراو مانایەکی گەورە دەخوڵقێنن و دەبنە شێعرێکی نموونە؛ قسەی خۆشیش هەروایە. ڕووداوێک یا زەوقی مشتوماڵکراوی خاوەن زەوقێک وشەکان بە جۆرێک دەباتە پاڵ یەک دە کۆتاییدا قسە و مەسەلێکی خۆش دەخوڵقێ و گێڕانەوەی ئەو قسە و مەسەلە بۆ گوێگر یا پەندێکی تێدایە یا بە لانی کەمەوە بزەیەک دەخاتە لێوی، نزیک بە چڵساڵە وەک ڕاوچی چاک، خۆم لە ڕاوی قسەی خۆش خستووەتە حەشارگە و زۆر قسە و بابەتی جوانم قۆستوونەوە. دە قسەکاندا بایخی زیاترم بەوانە داوە کە خاوەنیان مەعلوومە و بۆ قسەخۆشانی ناوچە وەک: «شەریف گابەگا»، «عابید»، «سەیدڕەشید»، «مامەندئاغا»، «حەمەدی مەلامەولوودی»، «حەمەدی سووکوتکەی»، «عومەرخان»، «حوسێنپزە»، «عەلیخەندان» و... جێی تایبەتم دیاری کردووە، ژمارەیەکی زۆر لە نەقڵەکان پێویستییان بە بیلامانێ و تەشپییات نەبێ و پەرژینێکی بە گوڵ و بە قایم بێ و دوور لە ڕووی ئەو مەجلیسە و ئەوبەرەوبەر هەیە و بڵاوکردنەوەیان دەو هەڵوەرجەدا بەعزەکەسانێک هەڵدەبەزێنێتەوە، ڕەنگە هێندێک لە بیستنی فلانە نەقڵ لە بارەی فلانەکەسیانەوە لووتمان لێ هەڵقرچێنن و بکەوینە بەر گلەیی و گازندەیان کە بۆچی فلانە قسەت لە بارەی فیسارەکەسماندا نووسیوە؟

بەڕاستی پەرچی سەر ڕێگەی نووسەر هەر یەک و دوو و سەت نین و تا زەمانێک

قەڵەم بە تەواوی ئازاد و توانایی بیستنی ڕەخنە و ڕاستییەکانمان دەبارەی خۆماندا نەبێ و بۆ نەدیتنی ڕواڵەتی درێوی خۆمان ئاوێنەکان بشکێنین، ناتوانین بڵێین کە پێمان ناوەتە قۆناغی شارستانییەت یا بە لانی کەمەوە لێی نزیک بووینەوە، ئێستا دوای ئەو هەموو ماوەیە، پازدە دەفتەری پڕاوپڕ نوکتە و قسەی خۆش ئامادەی چاپن و چاوەڕتەم دەگەڵ دەکەن؛ سەرجەم ناوی «خەزێنەی بزە»م لە سەر داناون. قسەم لە زمانی هەر کەسێکەوە بیستووە ناوەکەیم لە پاڵی نووسیوە و ئەو دەفتەرەم کردووە بە پێشەنگی دەفتەرەکانی دیکە. هەوڵم داوە، دەو دەفتەرەدا قسەی بە جورێکیان تێدا نەبێ.

هیوادارم تەمەن و تەمەن بەرم بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەو ئەرکە پێ نەگرن و بە زیندوویی سەر شاهیدی بە چاپ گەیشتنیان بم. بە پێویستی دەزانم لە بەر بەربلاوی ئەو کارەی دەستم پێکردووە داوا لە خوێنەرانی بەڕێز بکەم ئەگەر نەقڵ و ڕووداوێکی خۆشیان لە دەور و بەری خۆیان پێ شک هات بۆم بنێرن. ئەگەر نەمنووسیبنەوە یا پێشتر نەمبیستبن بە دڵنیایی دە شوێنی خۆیاندا و بە ناوی خۆیان کەڵکیان لێوەردەگیرێ و هەر نەبێ دەو پێیەدا دەبینە خاوەنی ئارشیڤێکی بەقەوەت بۆ داهاتوومان.

**ڕەسووڵ ڕەشنە حەمەدی**

**هەڵوەدای مەهاباد**

**١٣٩٠/٥/٤**

❖ زانایەک کوتوویەتی: با لە دنیا دۆست و ناسیاو و ئاشنات، کەم بێ؛ تا ئەگەر ڕۆژی حیساب ڕیسوا بووی کەم کەس بتناسێ.

❖ لە زانایەکیان پرسی نیشانە و عەلامەتی ئیمانداری چییە؟ کوتی: ١ـ قسە و کەلامی خۆش ٢ـ ئاکار و ڕەوشتی باش ٣ـ ڕوخساری بە بزە و پێکەنین ٤ـ میوانگری ٥ ـ ئەوەندەی لە دەستی بێ دەرحەق بە هەموو کەس چاکەی بێ.

❖ ئەو پرسیارەیان لە زانایەکی دیکە کردەوە کوتی: زمانی لە قسەی سووک و بێمانا بپارێزێ ٢ـ ڕق و قینی کەس دە دڵی خۆیدا ڕانەگرێ ٣ـ بە کردەوە خۆی لە گوناه و تاوان بپارێزێ ٤ـ دڵ و فکر و بیری لە کاری چەوت و هەڵە خاوێن کاتەوە.

❖ لە وەیسیان پرسی چۆنی؟ کوتی: چۆنە حاڵی ئەو کەسەی بەیانی لە خەو هەستێ و نەزانێ تا شەو دەژی یا نا؟ کەسێکی دی ئەو پرسیارەی لێ کردەوە، کوتی: جا چۆن بێ، حاڵی ئەو کەسەی کە هەر ڕۆژ مزڵێک لە مەرگ نزیک دەبێتەوە؟

❖ لە مەجلسی ئەنەوشێرەواندا، سێ زانا حازر بوون؛ ئەنەوشێرەوان ڕووی تێکردن و پرسی: بڵێن بزانم چ شتێک لە هەموو شتێک خراپترە؟ یەکەمی کوتی: پیری و

نەداری، دووهەمی کوتی: لەشی ناساغ و دڵی بەخەم، سێهەمی کوتی: نزیک بوونـەوە لـە مردن و دووری کردن لە چاکە.

❖ قازانجی دوژمنی ژیر، لە دۆستی نەزان زیاترە.

❖ لوقمانی حەکیم، کوڕەکەی بەو جۆرە پەنـد دەدا: دوو شـتان قـەت فـەرامۆش مەکە: یەک خوا و دوو مردن. دوو شتان لە بیر بەرەوە: چاکەیەک کـە دەگـەڵ خەڵـکی دەکەی و خراپەیەک کە یەکێک دەگەڵتی کردووە.
کاتێ چوویە مەجلیسێک ئاگات لە زمانی خۆت بێ.
کاتێ میوانی ماڵێک بووی، چاوچڵێس مەبە. کاتێ کەوتییە سەر سفرەی خەڵـک پێشـی نەوسی خۆت بگرە، کاتێ زیکری خوا دەکەی، جگـە لـەو، دڵـت لـە لای کەسـی دیکـە نەبێ.

❖ ئەفلاتوون دەڵێ: هەرچەند زانا بی خۆت بە نـەزان بزانـە و لـە فێربـوونی ئـەو شتەی نایزانی شەرم مەکە.

❖ لە ئەفلاتوونیان پرسی: چۆن بەم ڕۆژە و پلەوپایە گەیشتووی؟ کوتی: لە ڕاسـت کوتن و ئەمانەتداری و خۆ لە قسەی خۆڕایی پاراستن.

❖ لە زانایەکیان پرسی: چەنـد دۆسـتت هەیـە؟ کـوتی: ئێسـتا کـاتی خۆشـی و دەسەڵاتداریمە، دۆستی ئینسان تەنیا دە کاتی تەنگانە و لێقەوماندا دەناسرێ.

❖ لە ئەفلاتوونیان پرسی: کێ دەو دنیایەدا بەختەوەرە؟ گوتی ئەو کەسەی کە دە ژیانیدا کەسێکی خۆش بوێ. پرسیان لەو بەختەوەرتر کێیە؟ گوتی: ئەو کەسەی کە دوو کەسی خۆش بوێ. پرسیان ئەی لەو بەختەوەرتر؟ گوتی: ئەوەی هەموو کەسی خۆش بوێ و دلی هێلانەی ڕقی هیچ‌کەس نەبێ.

❖ دە گفتوگۆیەکی ڕۆژانەدا دەگەل پیرەپیاوێکی دنیادیتە باسی گەورەیی و جوامێری ئینسانانمان دەکرد، گوتی: ئەو جۆرەی کە ئینسان دەتوانێ بەناندان ناو و ناوبانگی پیاوەتی وە دەست بێنێ، هەرگیز ئەو ناوەی بە تفەنگ بۆ وە دەست نایە.

❖ سێ تاقم قەدری سێ شتان دەزانن: پیر قەدری گەنجی، ناساغ قەدری ساغی و هەژار قەدری مالی دنیا.

❖ پیاو کەسێکە لە کەس نەڕەنجێ و کەسیش لە خۆی نەڕەنجێنێ.

❖ ئەفلاتوون گوتی: ئەگەر ئەقلی ئادەمیزاد بە سەر نەفسیدا زال بێ ڕۆژگار دەبێتە بەندەی ئادەمیزاد. بەلام ئەگەر نەفس بە سەر ئەقلیدا زال بێ، ئادەمیزاد دەبێتە بەندەی ڕۆژگار.

❖ ئەگەر سوڕ و ڕازێکت دە دلدایە لە لای دۆستانی نزیکی خۆت مەیدرکێنە، چونکی دۆستی نزیکت ڕازی تۆ لە لای دۆستانی نزیکی خۆی دەدرکێنێ.

❖ خەبەریان دا بە هەژار گوتیان زستان هات، گوتی: ئامادەم بۆ هەلّلەرزینێ.

❖ سێ تاقمە کەسان دەو کاتانەدا دەناسی: ئینسانی لەسەرخۆ دە کاتی تووڕەبووندا، مرۆی بێغیرەت دە ڕۆژی شەڕ و لێقەوماندا، دۆست و ڕەفیق دە کاتی تەنگانەدا.

❖ لە دڵپاکێکیان پرسی: ئەو کاتە چ کاتێکە کە بە فیڕۆ لە کیس ئینسان دەچێ؟ کوتی: ئەو کاتەی کە دەرحەق بە کەسێک چاکەیەکت لە دەست دێ و نایکەی. لێیان پرسی ئەی چ عەیبێکە کە ئەگەر دە ئینساندا بێ هەموو هونەرەکانی لە ناو دەبا و دایاندەپۆشێ؟ کوتی: حەسوودی و بەغیلایەتی.

❖ چوار شت پشتی پیاو دەشکێنێ: دوژمنی زۆر، قەرز، منداڵی زۆر، ژنی لاڕێ.

❖ لە ئەفلاتوونیان پرسی دە دنیایەدا چۆن ژیاوی؟ کوتی: بە ترس و لەرزەوە هاتمە سەر دنیا، بە ڕاماوی ژیام، بە پیسی دەڕۆم، هەر ئەوەندەی تێگەیشتم کە هیچی لێ تێنەگەیشتم.

❖ لە دڵپاکێکیان پرسی: چۆنی؟ کوتی: ڕۆژی خوا دەخۆم و دە ژێر فەرمانی شەیتاندام.

❖ لە دڵپاکێکیان پرسی: چۆنی؟ کوتی: جا چۆن بم، دە کاتێکدا کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە تەمەنم کەم دەبێتەوە و ژومارەی گوناه و تاوانەکانم زیاد دەکەن.

❖ لە جێیەکی دی، پرسیان چۆنی؟ کوتی: دەبێ چۆن بێ حاڵی کەسێک بزانێ

وەختی حیساب و لێپرسینەوە دادێ و ئەو کەسانەی ئەو مەوعیزە و ئامۆژگاری کردوون لە بەر چاوی ئەو بچنە بەهەشت بەلام بۆ خۆی بچێتە جەهەنەم.

❖ لە برسییەکیان پرسی: یەک و یەک دەکاتە چەند؟ گوتی: دەکاتە دوو کوللێرە.

❖ کوڕێک ڕۆیشتە خوازبێنی کچێک، کچە گوتی: دەست ڕاگرە و پەلە مەکە. ئەگەر دڵنیا بم کەسی دیکە نامخوازێ مێردت پێدەکەم.

❖ بە ڕەحمەت بێ دەروێش ئەحمەدی تەنەکەساز (میرمەحموودی) کاتێ لە ماڵ خواردەمەنییەکیان دانابا و منداڵەکانی لە خواردنێ گەرم نەبان و خۆیان گنخاندبا، دەیگوت: ڕۆڵە زووکەن بیخۆن دەنا ئێستا دۆستێک دێ و کاری دوژمنێکمان دەگەڵ دەکا. (مەبەستی لەوە بوو کە میوانێک دێ و دەگەڵمان دەخوا).

❖ کاک قادری برام گێڕایەوە: لە میراوێ مەلاخەلیل پیرەپیاوێکی هەشتاساڵانە سێ تەلاقەی خست و گوتی: هەتا ئێستا کە تەمەنم گەیشتووەتە هەشتا، هێشتا تاقەچایەکم بە عومراتی خۆم بە کەیفی خۆم نەخواردووەتەوە، بە سەرسووڕماوی پرسیمان جا چۆن شتی وا دەبێ؟! گوتی: بۆ نابێ؟ من لە ماڵی خۆم چای بە تاقەکلۆقەندێک دەخۆمەوە، ئەگەریش لە ماڵان میوان دەبم بە سێ کلۆیان دەیخۆمەوە؛ کەچی بە دڵی خۆم پێم خۆشە بە دایم چای بە دوو کلۆیان بخۆمەوە.

❖ کوردە ڕۆیشتە لای مامۆستا و گوتی: ئەرێ جەنابی ئاخوڕ ئەم کچەوڵییەی

لە دەشتی سەنعان سەگەگەل خواردییان ناوی یۆنس بوو؟ مامۆستا کوتی: ئـاخوڕ نـیم و ئاخوندم، کچ نەبوو و کوڕ بوو، وەلی نەبوو، نەبی بـوو، دەشـت نـەبوو چـاڵ بـوو، سـەنعان نەبوو کەنعان بوو، سەگەل نەبوو گورگـگـەل بـوو، یـۆنس نـەبوو یۆسـف بـوو، جـا ئێـژی کامەیانت بۆ ڕاست کەمەوە؟

❖ شەوێکی بەهاری ١٣٧١ میوانی سەیدعەبدوڵـلا سـەمەدی بـووم. دە درێـژەی قسەکانماندا باسی ئیعجازی قورئان و تەقویمی مـەغوولیمان کـرد. پـاش پشـکنینەوەی کتێبخانە خشپیلانە و ڕێکوپێکەکەی بەو شـتانە گەیشـتین: لـەو شـتانەی کـە سـەیر و سەرنجڕاکێش و دە قورئاندا دۆزراونەوە ئەوانەن: هێندێک لـە وشـەکان لـە بـاری مانـاوە پەیوەندییان پێکەوە هەیە و بە ژوماری مساوی و بەرابەر ناویان هاتووە.

حەوت جار حەڕب، حەوت جار یەخسیر گرتن

٧٥ جار قەلیل، ٧٥ جار شەکوور

١٧ جار زال و موزیل (لاڕێ)، ١٧ جار مووتا (مردوو)

١٥٤ جار کافرین، ١٥٤ جار نار و حەریق

٣٢ جار زەکات، ٣٢ جار بەرەکات

٤٩ جار عەقڵ، ٤٩ جار نوور

٢٥ جار لیسان، ٢٥ جار مەوعیزە

٣٤ جار غەزەب، ٣٤ جار فاحیشە

١٤٥ جار حەیات، ١٤٥ جار مەوت

١١٥ جار دنیا، ١١٥ جار ئاخیرەت

❖ بۆ دیاری کردنی ئەوەی کە هەر ساڵـێکی کـۆچی هـەتاوی ڕێکـەوت دەگـەڵ

ناوی چ حەیوان و ئاژەڵێک دە تـەقویمی مەغوولیدایـە دەبـێ ئـەو ساڵـە بکەینـە دوازدە بەش، باقی ئەو تەقسیم و دابەش‌کردنە ژومارەیەکە کە پەیوەندی بـە ژومـارەی یـەکێک لەو ئاژەڵانەوە هەیە، ئەڵبەت دەبێ دە پێشـدا ئـەو دوازدە ئاژەڵانـە بـە جـوری خـوارەوە بنووسرێ و لە سیفرەوە تا یازدە ژومارەیان بۆ دابندرێ:

٠- مار ٢- ئەسپ ٣-مەڕ(پەز) ٤- مریشک (مامر)

٥- سەگ ٦- بەراز ٧-مشک ٨- مانگا

٩-پڵینگ ١٠-کەروێشک ١١=نەهەنگ

بۆ نموونە من کە لە دایکبووی ١٣٣٢ی کۆچی هەتاویم، دەبێ ئەو تەقسیمە بکەم:

١١=١٢÷١٣٣٢ چـون پاشمـاوەی ئـەو تەقسـیم و دابەشـکرنە سـیفرە، کـەوابێ مـن لـە دایکبووی ساڵی مارم.

❖ سوالکەر: کاکە لێقەوماو و برسیم دە ڕێی خوادا پەنجا تمەنم بدەیە نـەهارێکی پێ بخۆم.

ڕێبوار: پووڵت نادەمێ، بەڵام وەرە بە کەیفی خۆت نەهارێکت بۆ دەکڕم.

سوالکەر: لاچۆ، بڕۆ، نەمانەویست؛ ئەوڕۆ بۆ خـاتری پەنجاتمـەنی بـێ‌قابیـل ناچـار بـووم شەش‌نەهاران بخۆم.

❖ دوو دۆستی گیانی، پێکەوە بۆ سەفەر، سـواری کەشـتییەک ببـوون. لـە ناکـاو دەریا شێوا و بوو بە تۆفان و کار گەیشتە جێیەک چیوای نەمابوو کەشتییەکە نـوقمی ئـاو بێ، دەو کاتەدا یەکێک لەو دوانـە دەسـتی بـۆ ئاسمـان هەڵـێنا و گـوتی: خوایـە گیـان بۆخـۆت دەزانی مـنی ڕووڕەش دە درێـژەی تەمەنمـدا هـیچ گونـاه و تاوانێـک نـەماوە نەیکەم، ئەگەر بێت ئەونۆرەی لـەو بەڵایـە نـەجاتم دەی خوایـە گیـان بـەڵـێنی دەدەم

تازە... کاتێ قسەوپاڕانەی گەیشتە ئێرە، دۆستەکەی دەستێکی لە شانی دا و کوتی: لە تۆبەکردن پەلەی مەکە، هۆووتا ئیشکایی وە دەر کەوت.

❖ نە خۆش بە شڵەژاوی ڕووی کردە دوکتوری نشتەرکار (جەڕاح) و کوتی: جەنابی دوکتور ئەوە یەکەمین جارە دە ژیانمدا قەرارە نشتەرکاری کرێم، زۆر دەترسم. دوکتور بزەیەکی هاتە سەر لێو و کوتی: ترس و نیگەرانیت خۆڕاییە، چونکی منیش یەکەمین جارە نەخۆشێک دەخەمە بەر نشتەرکاری و هیچیش نیگەران نیم.

❖ پیاوێکی درۆزن و خۆهەڵکێش دە مەجلیسێکدا دەیکوت: هەموو وڵاتانی ئاسیا و ئورووپا و ئافریقا گەڕاوم، یەکێک دەو مەجلیسەدا کوتی: کەوابێ بەو حیسابە شارەزایی چاکت لە سەر جوغرافیا هەیە؟ کوتی: بەڵێ ئەزقەزا سێ مانگیش لەوێ ماومەوە!

❖ کارێکی وا بکەن قەت سەر و کارتان نەکەوێتە ئیداران مەگەر ئەوەی کە دڵنیا بن قسەتان وە سەر دەکەوێ.

❖ لە کەسێک کە دە قسەکانیدا زۆر وشەی «من» بە کار دەبا و هەر دەبارەی خۆیدا دەدوێ قەت چاوەڕوانی ئەوەت نەبێ کە چاکەیەکت دەگەڵ بکا.

❖ بەرلە زەماوەند تەنیا پرس و ڕا بە کەسێک بکە، ئەو کەسەش بۆ خۆت بە.

❖ شێتێک لە قەراخی چۆم سەر و پێی چا دەکرد، لە ناکاو سەرەکەی لێ کەوتە

نێو ئاو؛ شێتە قولەگیایەکی دەست دایە و ملی نا لە بانگ‌کردنی سەرەکە و بە دوایدا ڕۆیشت، شێتێکی دیکە چاوی لێی بوو گوتی: شێتە سەری بێ لاق کوا دەتوانێ لە ئاو بێتە دەر؟! لانی‌کەم قاچکەکانی بۆ تێباوێ تا پێیان بێتەوە دەرێ.

❖ حەمە، گوێدرێژەکەی بە باراشەوە بەرەو ئاش وە پێش خوی دابوو، لە ڕێگا تووشی دەستەیەک قومارباز بوو داوایان لێکرد لەگەڵیان قومار بکا. دەپێشدا لە سەر کەرەکەی دۆڕاندی، ئەو جار لە سەر باراشەکەی، دۆڕاندی، ئەو جار لە سەر گوریسەکەی، دۆڕاندی، ئەو جار لەسەر کەوا و پاتۆڵەکەی، ئەوانیشی دۆڕاند، بە کراس و دەرپێوە بەرەو ئاوایی گەڕاوە، بەرەو پیری چوون و گوتیان: کوا گەنمەکەت؟ گوتی: بوو بە ئارد و با هات و گشتی برد، پرسیان کوا کەرەکەت؟ گوتی: بوو بە شێر و چوو بە قەد کێوا. گوتیان: کوا گوریسەکەت؟ گوتی: بوو بە مار و چوو بە کونا. گوتیان: ئەی ماڵ کاول کوا تێرەکەت؟ حەمە توورە بوو گوتی: باوکم بۆ حاڵی ناون؟ ڕووتمیان کرد، ڕووتمیان کرد.

❖ دوو تەنبەڵ دە وەتاغێکی سێ‌وچواردا دانیشتبوون، یەکیان لەوی‌تری پرسی: تۆ بە چەند سەعاتان دەگەیە ئەو سەری دیوەکە؟ گوتی: بە چوار سەعاتان، ئەوی‌تریان گوتی: حەللەلا گوللەیە!

❖ پیاو بە بێکەسی هەژار دەبێ، ژن بە بێکەسی بێعار دەبێ.

❖ ژاندەرمەیەک کە سابیقە و پێشینەی بەرتیل خواردنی دەبێ لە مەزرایە تووشی یەکێک دێ و هەرای لێدەکا: گێ (بە تورکی وەرە) کابرا لەبەری هەڵدێ و

دووراودوور دەڵێ: بڕۆ ماڵت نەشێوێ، پارەکەشت گێلاندم، قامچیت لە ملی هاڵاندم، چی پێم بوو لێت ستاندم.

❖ کاک قاسمی ڕەفیقم زۆر جار کە لە ماڵ چێشتیان بۆ لێدەنا، مووی تێدا بوو؛ ئەگەر هەر بۆ خۆیان بایەنَ، دەیکوت: فەرموو موو، ئەگەر میوانیان بایە بۆ ئەوەی میوانەکە حاڵی نەبێ و بێزی هەڵنەستێ ئایەتەلکورسی دەخوێندەوە و کە دەگەیشتە یەعلەموو بە دەنگێکی بڵیند دەیکوت: یەعلەموو و بەم جۆرە ژنەکەی حاڵی دەکرد کە چێشتەکەی دیسان مووی تێدایە.

❖ سەید برایم ساداتی نەژاد بە ڕەحمەتی خوا شاد بێ، گێڕایەوە: کابرایەک مرد و کەسێکیدی ژنەکەی مارە کردەوە. ژنەکە زۆر خراپ بوو و دەگەڵ مێردی تازە نەدەحاوایەوە. مێردی تازە ڕۆژێک دەچێتە سەر گۆڕی کۆنەمێردی ژنەکەی و بە سۆزەوە دەگری؛ کەسێک دێ و دەڵێ: براله دە شەرع و دینی ئێمەدا گریانی بەو جۆرە باش نییە، بڵێ بزانم خاوەنی ئەو قەبرە کێیە؟ دەڵێ: کۆنەمێردی خێزانمە. دەڵێ: جا خۆ مردنی ئەو بە قازانجی تۆ تەواو بووە و گریانی ناوێ. دەڵێ: نەخێر، ئەو کابرایە مەزلووم و زوڵملێکراوی بەڕاستییە چونکی تا مردن دەگەڵ ئەو ژنە هەڵیکردووە، یەکەمدوای ئەوە ئەگەر نەمردبا من تووشی ئەو ژنە و ئەو ژیانە نەگبەتەی نەدەبووم.

❖ شوانێک عیبادەتی خوای دەکرد و دەیکوت: تەبەنێک و ڕەبەنێک، خوایە ئەگەر لەوەی زیاتری دەزانم و نایڵێم ڕووم ڕەش کەی. عالمێک گوێی لەو مناجاتە بوو هەستی بەوە کرد کە مناجاتی شوانە دڵچەسپە و دەگاتە شوێنی خۆی، ئەویش لاسای شوانی کردەوە و کوتی: تەبەنێک و ڕەبەنێک خوایە ئەگەر لەوەی زیاتری دەزانم و

نایلێم ڕووم ڕەش کەی، دەسبەجێ ڕووی ڕەش بوو.

❖ عەلی خەندان لە بۆکان بونگای معاملاتی بۆ کڕین و فرۆشتنی خانوو دانابوو. ڕۆژێک ناسیاوێکی دەچێتە لای و داوای لێدەکا خانووەکەی بۆ بفرۆشێ. عەلی خەندان کە دەزانێ ئەو کابرایە سەرجەم ماڵەکەی ٨٠ میترە و زۆر ڕەختە و قایم ساز کراوە، دەپرسێ: بە تەمای کڕینی خانووی گەورەتری؟ دەڵێ: نا، دەڵێ: دەیجا خۆ ماڵەکەت هیچ عەیبێکی نییە، بۆ دەیفرۆشی؟ دەڵێ ڕاستییەکەی جیرانێکم هەیە گوڵەکەرێکی هەیە ویسعەتی لێ هەلگرتووین وەخت و بێ وەخت دەزەڕێنێ، عەلی خەندان دەڵێ: براله ئەوە بۆ فکر نابێ، تۆ لە خۆڕا ماڵەکەت مەفرۆشە کوڵەوار دەبی و وەک خۆت لێ نایەتەوە، پێکەوە دەچین من جیرانەکەت حاڵی دەکەم با ئەو عیلاجی کەرەکەی بکا.

لە سەر ئەو بڕیارە بە دوو قۆڵی دەچنە لای کابرا و داوای لێدەکەن کەرەکەی بفرۆشێ و ئەو هاوسێ باشەی لە کیس خۆی نەدا. کابرا دەڵێ: چاو لێکەن من پیرم، شەلم، چێودارم، بۆ کڕینی مەڕ و ماڵات هاموشۆی دێهات دەکەم، ئەو کەرە لاقی سەفەرمە، خەڵک پەیکان و بێنز و نەیسان پاترۆلیان هەیە، ئێوە ئەو کەرەش بە من ڕەوا نابینن؟!

عەلی خەندان کە دەبینێ کابرا ڕاست دەکا، دەڵێ: دەیجا نایفرۆشی بە لانی کەمەوە عیلاجێکی بکە، کابرا دەڵێ: جا چ دەڵێن هەتا وای لێبکەم.

عەلی خەندان تۆزێ بیر دەکاتەوە بۆ ئەوەی کوڕەکە بە پێکەنێن بە جێ بێڵێ دەڵێ: ئەگەر بە من دەکەی برۆ بە سرتە بە گوێی کەرەکەت بڵێ لەمەو بە دواوە گەورەی ماڵێی، بێتوو ئەو قسەیە باوەڕ کا و بزانێ خەرجی ماڵ بەڕێوەبردن ئاوا گران بووە، هیچ گومانم لەوە نییە زەڕەی لێدەبڕێ. کابرا پێدەکەنێ و بەڵێنی دەدا ئەو کەرە بفرۆشێ و کەرێکی یەختە بکڕێتەوە.

❖ کابرا چاویلکەیەکی دوودی (ڕەش) کردە چاوی کوڕەکەی لە پەنادەستی ڕاوەستا بوو بە هەموو دەمایەخۆی زللەیەکی لە بناگوێی ڕاکێشا و کوتی: تووتکەسەگ بەو شەوە بۆچی لە ماڵ هاتوویە دەر؟

❖ کابرایەک چەقۆیەکی ون کرد زۆر بۆی ناڕەحەت بوو، دوستێک پێی کوت: براله خەم خواردنی ناوێ، چەقۆیە و ونت کردووە، هێندەی فکر لێ مەکەوە. کابرا کوتی: دە خەمی ون کردنەکەیدا نیم، ناڕەحەتی ئەوەم کەوتبێتە دەست بنیادەمێکی ناشی و قەدری نەزانێ و دە کاتی تیژکردنەوەیدا چەقەسووی کا.

❖ لە وشتریان پرسی: لە کوێ ڕادێیەوە؟ کوتی: لە حەمامڕا. کوتیان ڕاست دەفەرمووی بە خێرییەوە، بە پانییەی ساف و لووس و خاوێنت ڕا دیارە.

❖ ماشێنی شەوڕەوی مسافیر هەڵگر لە تارانەوە بەرەو مەهاباد دەهات لە نزیک قالیانتاغ چەتە پێشیان پێ‌گرت و ناچار بە ڕاوەستانیان کرد، چەتەیەکی ڕووبەستە هاتە سەر، ژنێک لە پێشەوە دانیشتبوو، چەتە ڕووی تێکرد و پرسی ناوت چییە؟ ژنە بە شلەژاوی کوتی: ناوم مەنیجە، چەتە تۆزێک ڕاما و کوتی: بە حورمەتی ئەوەی کە دایکی خۆم ناوی مەنیجە کارم بە تۆ نییە و تەنانەت ئەگەر کلوورێکیشت زێڕ پێبێ مسقالێکت لێ ناستێنم، لەو ڕەد بوو پیاوێکی سمێڵ‌زل دانیشتبوو پرسی کوڕە بڵێ بزانم تۆ ناوت چییە؟ کابرا کوتی: ئەگەر قەرارە ڕووتمان کەی ناومان بزانی و نەزانی بە کاری چی دێ؟ کوتی: نا من وەختایەک کەسێک ڕووت دەکەم دەبێ بزانم کێیە و دە ڕۆژی مەبادایەدا دەگەڵ کێ تەڕەف دەبم. کابرای سمێڵ زل زەردەخەیەکی هاتێ و کوتی: ناوم حەمەیە بەڵام لە ماڵێ لە خۆشەویستییان پێم دەڵێن مەنیج.

❖ کابرایەک کەری ون کرد، نەزری کرد ئەگەر کەرەکەی ببینێتەوە سێ ڕۆژان بە ڕۆژوو بێ. دوای گەڕانێکی زۆر کەرەکەی بە تۆپیوی دە کەندالێکدا دیتەوە لە نارەحەتی و تووڕەییان سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕی و کوتی: پیاو نەبم ئەگەر ڕەمەزان شەش ڕۆژوویان نەخۆم.

❖ لۆتی هەباس و لۆتی مەحموود چەند ساڵ بوو لە هەوشار شەریک و هاوڕێ بوون. یەکیان دەهوڵی دەکوتا و ئەوی‌تریان زوڕنای دەژەنی، ئاخری بڕیاریان دا لێک جیا بنەوە. یەکیان دەهۆڵەکەی دەسدایە و ئەوی‌تریان زوڕناکەی، بەڵام بۆ مەیموونەکە کوتیان: لێرە بەرەڵلای دەکەین یەکمان لەو دیوەی گرد دەبین و ئەوی‌ترمان لەو دیوی گرد، دەیکوتین و لێیدەدەین، با مەیموونەکە لە هەڵبژاردنی خاوەنی خۆی سەرپشک بێ، بۆ لای هەرکاممان هات با بۆ ئەومان بێ، جا بە نۆرە کەوتنە لێدان و کوتانێ و مەیموونی بێچارە دەنگ لە هەر لایەکڕا هاتبا، بۆ ئەو لایە ڕای دەکرد. سەرەنجام مەیموون هێندەی غارغارێن و ئەو دیوە و دیوی گردی کرد، پسا و حەیاتی لێ بڕا.

❖ لە شێتێکیان پرسی: ڕات لە بارەی نۆشابەدا چییە؟ ئەو کە نۆشابەی زۆر پێ خوش بوو کوتی: نۆشابە بۆخۆی شارێکە ئاوی هەیە، گازی هەیە، حەیف کارەبای نییە.

❖ کابرایەک تووشی ڕاوچییەک بوو سواری ئەسپێک ببوو تفەنگێکی لوولەدرێژی دە شاندا بوو، تاژییەکی دە ڕستە کردبوو، گوێنییەکی گەورەی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا.

کابرا پرسی: بەو هەموو شتانەوە چۆن دەتوانی هەڵسووڕێی و ڕاوێ بکەی؟

ڕاوچی کوتی: ئەگەر تەماڵ هەستا و دوور بوو بەو تفەنگەی دەیئەنگێوم، ئەگەر نزیک

بوو ئەو تازییەی تێبەردەدەم، ئەگەر بچێ دە لا نێوە بەو گوێنییەی قانگی دەدەم و ناچاری دەکەم بێتە دەرێ.

کابرا سەرێکی لێ ڕاوەشاند و کوتی: تۆ بەو هەمموو تەگبیرەی لێت کردووە، مەگەر کەروێشکی بێچارە بکەوێتە بەر ڕەحمی خوا دەنا قەت لە دەستانت نەجاتی نابێ.

❖ لە کەچەڵاوێی سەردەشت، میرزا ڕەسوویەکی لێبوو یەکجار فەقیر و نەدار بوو، بەڵام دە زەمانی خۆیدا میرزایەکی قابیل و خەتخۆشێکی کەموێنە بوو. ماڵی کوێخا سێمانیش هەتا بڵێی دەوڵەمەند بوون، کاتێ خەڵک لێرە و لەوێ بە دەسبەتاڵی دەچوون، هەتا میرزا ڕەسووعەریزەیان بۆ بنووسێ، میرزا ڕەسوو قەڵەم و قەڵەمدان وکاغەزی دەست دە دایە و میوانی وە دوای خۆی دەدا و یەکسەر دەڕۆیشتنە ماڵی کوێخا سێمان. میرزا ڕەسوو بە شێنەیی گوێی دەدا کابرا و فکری لێدەکردەوە و عەریزەیەکی باشی بۆ دەنووسی. ماڵی کوێخاش ناچار دەبوون نان و شێوی حیسابی ساز کەن و تووشی خەرجێ بن. میرزا ڕەسوو هەمموو جاران خۆی دەگنخاند و هەتا شام یا نەهارەکەی لە ماڵی کوێخا سێمان نەخواردبا هەڵنەدەستا، بەو جۆرە کوێخا سێمان جاڕز بوو، بە خەڵکی ڕاگەیاند هیچکەس حەقی نییە بە دەسبەتاڵی و بێدەست و دیاری بچێتە ماڵی میرزا ڕەسوو.

❖ دوو کەس حەمەدە و ئەحمەدە پێکەوە چوونە ڕاو، بۆ دیتنەوە و هەستاندنی تەماڵ ئەحمەدە وە قەدی شاخ هەڵگەڕا و حەمەدە لە خوارەوە ماوە. ئەحمەدە تاوێرێکی گەورەی بەرەو خوارەوە جاڵە کردەوە، تاوێر هات و هات و بە زەربەت وە سەری حەمەدەی کەوت و سەری حەمەدەی پەڕاند. ئەحمەدە خۆی گەیاندە سەر کەلاکی حەمەدە و هەرچەندی دەلاقانی کوتا حەمەدە نەجووڵاوە، ناچار مەیتەکەی بە

جێهێشت و گەڕاوە ئاوەدانی و ڕۆیشتە بەر دەرکی ماڵی حەمەدە و هەرای لە ژنەکەی کرد: ئەرێ هۆی براژن، هۆی براژن، ژنی حەمەدەی سەری لە دەلاقە هێنا دەر، ئەحمەدە کوتی: ئەرێ براژن بەیانی وەختایەک دەگەڵ حەمەدەی چووینە ڕاو، حەمەدە سەری پێوە بوو؟

ژنی حەمەدەی دەحاڵێکدا زارجوو بنێشتێکی دە زاریدا هەڵدەسووڕاند کوتی: ڕاستییەکەی خاترجەم نیم بەڵام پێم وابێ بەیانی وەختایەک بە کەچکان ماشینەی هەڵدەقوڕاند سمێڵەکانی دەجوڕانەوە. (مەبەست دەجووڵانەوە)

❖ دووکاندارێکمان لە گەڕەکێ بوو نێوی کاک حەبیب بوو. منالێکی چکۆلە لەو کووچەیە بوو لە جیاتی کاک حەبیب دەیگوت: کاحبەباب. کاحەبیب ئەو نێوەی زۆر پێخۆش بوو شتی بە خۆڕایی دەدایە و پارەی لێ وەرنەدەگرت.

❖ سەید حەمە مالی لە گەڕەکی هەرمەنیان بوو، هەرچەند زۆر پیاوی چاک بوو تەنانەت خەلک بۆ نوشتەنووسین دەچوونە لای بەلام ژیانی زۆر بە سەختی ڕادەبوارد و کون و کەلەبەری ژیانی بە زۆری بۆ پڕ نەدەبۆوە، تەهای کوڕی چکۆلە بوو، جار و بار کە بۆشتێک گڕنەی دەگرت و سەید حەمەد توانای جێبەجێ کردنی نەدەبوو، تەها هەرای دەکرد: حەمە کوێر، بۆم جێبەجێ دەکەی باشە دەنا دەچمە سەر بان و هەرا دەکەم و دەڵێم: شەوانە بابم ڕادیۆ بی‌بی‌سی دەگرێ.

❖ ڕەجەب بەردێک داوێ و لامپی بەر دەرگای مالی غەفووری ماشەرەفێ دەشکێنێ، پاشی سەعاتێک دەچێ لە دەرکەی مالی کاغەفوور دەدا و دەلێ: من لامپی پێش دەرکەی ئێوەم شکاندووە ئێستا ویژدانم قبووڵ ناکا و قەتم حەرام نەخواردووە و

خەیانەتم بە کەس نەکردووە، دووسەتمەنم بدەنێ دەچم لامپەکەتان بۆ دەکڕمەوە، هەرچی دەڵێن قەیدێ ناکا لامپ بە قوربانی خۆت بێ، قبوولی ناکا و دەڵێ: نەیکڕمەوە خەوم لێناکەوێ. ئەوانیش عیلاجیان نامێنێ دووسەتتمەنی دەدەنێ، ڕەجەب دەچێتە بازاڕ و لامپێک بە سە تمەن دەکڕێ و سە تمەنەکەی دی دە تەنگەی باغەڵی دەنێ.

❖ سەید جامی سەید نەژادیان گێڕایەوە: گۆڵێ، گوندێکی سەر بە شاری سەردەشتە. زەمانی شا، باباغای گۆڵێ بەردەوام دمی دە سیاسەت وەردەدا و خۆش خۆش دەیانگرت و دەیانبردە زیندان. باباغا هەموو جاران کە لە زیندان بەریان دەدا لولێنە و بەرماڵەکەی جێ دەهێشت، ئەگەر دەیانپرسی بۆچی ئەوانە بە جێ دێڵی؟ دەیکوت بە قوربانوو بم، با ئەوانە لێرە بن دەزانم بەو زووانە دەمگرنەوە و دەمهێننەوە ئێرە با جێگاکەم نەگیرێتەوە. (لولێنە شتێک بوو وەک حەوجۆش بەلام لە گڵ ساز دەکرا).

❖ دوو کەس خەریک بوون بۆمبیان دە ماشینێکدا دادەناوە، یەکیان کوتی: ئێستا ئەگەر بتەقێتەوە چبکەین؟ کوتی: نیگەران مەبە بۆمبێکی دیکەم پێیە.

❖ کوڕە دەگریا؛ بابی پرسی: بۆ دەگری؟ کوتی: ئاشق بووم، ـ باشە ئاشقی کێ بووی؟ ـ هەرکەس تو پێت باش بێ!

❖ کوڕە جلی ڕەشی پۆشیبوو، کوتیان: خوا ناخۆشیت نەداتێ چ قەوماوە؟ کوتی: بابم مردووە، پرسیان ئەی بۆ کراسەکەت ئاوا دڕاوە؟ کوتی: ئاخر نەیدەهێشت بینێژین.

❖ وەرە با پێکەوە ببینە دوو کۆتری ئاشق و لە شەققەی باڵ دەین و بڕۆینە سەر گڵۆپکی هۆ و دارە هێلانەیەک ساز کەین تۆ هێلکە بکە و من دەچم تەماتان دەکرم ئۆملێتێکی ساز دەکەین.

❖ یەکێک لە پشت ماشێنەکەی نووسیبووی دوو جار دوو دەکاتە شازدە، لەو بەریش نووسیبووی: کێ بەکێیە؟

❖ لە دۆستێکی شاعیرمیان پرسی: بۆچی شیعرەکانت لە چاپ نادەی؟ کوتی: دەخۆم ڕا نابینم پێم وایە هێشتا نەبوومە ئەو شتەی بەتەمایم، کوتیان: لەو قسانە گەڕێ باری قورس نە هەڵدەگیرێ نە دادەنرێ.

❖ هەوای ساردبوو تفت هەلاویشتبا دەیبەست. کابرایەک بە پەلە خۆی بە دوکانی عەلی خەندانیدا کرد و کوتی: وای وای لەو سەرمایە! تۆ بڵێی چەند دەرەجە بێ؟ عەلی خەندان کوتی: گۆیا هەواشناسی کوتوویەتی پازدە دەرەجە ژێر خاڵە، کابرا دەحاڵێکدا لە بەر کوورەی دووکان خەریکی خۆ گەرمکردنەوە بوو، کوتی: وەڵڵا بۆکان بێکەسە دەنا ئەو هەوایە لە سەت دەرەجەش زیاترە.

❖ زێوەی کەبابچی دەیکوت: زۆربەی مشتەرییەکانی من خەڵکی دێن و بەشی زۆریان ئەگەر بێنە شار و کەبابی نەخۆن هەر وە نازانن هاتوونە شار، ئەگەر ساڵێکی وەزعی کەشاوەرزییان باش و حاسڵاتیان زۆر دەبێ وەختایەک دێنە کەبابخانە دەڵێن های زێوە نانێک و شەش کەبابمان بۆ بێنە، بەڵام وەختایەکی حاسڵاتیان باش نابێ، دەڵێن شەش نان و کەبابێکمان بۆ بێنە.

❖ کابرایەک بە درێژەی تەمەنی بە دەستەنگی ژیابوو و قەتی خێر و خۆشی لە ژیانی نەدیبوو بەو حاڵەوە تەمەنی گەیشتبوو نەوەد ساڵی و لە دەست و پێ کەوتبوو و زەلیلی سەر جێی بوو ها ئەو ڕۆ بمرێ ها سبەینێ؛ دەو کاتەدا لە ناکاو بە پێی قورعە و شانس و بەخت پوولێکی زۆری لە بانک بۆ وەدەرکەوت. نوێنەری بانک بۆ تەبلیغات بۆ بانکەکەیان بە خۆی و دووربین و کامێراوە هاتە لای و پرسی ئێستا کە ئەو پوولە زۆرەت بۆ وە دەر کەوتووە بەتەمای چی لێ بکەی و چی پێ بکەی؟ گوتی: دەمەوێ وەسیەت بۆ شارەداری بکەم دوای مردنم لە نێوەڕاستی شار لە جێیەکی قەرەباڵغ و پڕحەشیمەت بەو پوولەی من، چەند چاوە ئاودەست ساز کا تا هەر کەس هات، دەو بەخت وشانسەی من برێت.

❖ لە منداڵی ڕاگوێم لە «چەسپی» حەمەدۆڵ دەبوو، لە چەکۆی ڕا هەتا سەردەشت جۆرە چەسپێکی ئاو هەبوو پێیان دەگوت چەسپی حەمەدۆڵ، زۆرم پێ سەیر بوو ئەو چەسپە بۆچی ناوەکەی کوردییە؟ تاوەکوو پاشی چەند ساڵ تووشی کابرایەک بووم پینەچی بوو، حەمەدۆڵیان پێدەگوت. زوو نێوی چەسپەکەم وە بیر هاتەوە، گوتم ئەرێ کا حەمە ئەوە بۆ ئەتۆ و ئەو چەسپە ناوەکەتان یەکە؟ گوتی: ساڵان هیچ‌کەس نەیدەوێرا دەست بۆ کارێکی خراپ ببا یا دەسەوداو کاردا خرابێ یا فێڵێکی بکا ئەگەر وای کردبا تازە نێوی ئەو هەڵە و ئیشتیبایەی بە ملیدا دەبڕا و لێی دەبوو بە قیلی کەوای سپی، بۆ یەکەم جار کە ئەو چەسپە پەیدا بوو، چوومە شار کڕیم، چوزانم خراپە و بۆ کەوشان نابێ؟ قدولکەیەکم کڕی و دەگەڵ خۆم هێنامەوە میراوێ و دەستم بە پینەکردنی یەکەم کەوش کرد. وەختایەک کەوشەکەم داوە بە کابرا سەعاتێکی پێنەچوو کەوشەکەی بە دەستێکەوە و پینەکەی بە دەستەکەی دیکەیەوە هاتە لام و دەنگی هەڵێنا و گوتی: جا ئاخر وەستا ناچار پینە لە کەوش دان ئاوا دەبێ؟

جەماعەتێک لەوێ بوون کوتم: خـەتای چەسـپەکەیە دەسـتیان دا قـدوی چەسـپەکە و پێکتریان نیشان دا و لەمەو بە دوا نێوی ئەو جۆرە چەسپە بوو بە چەسپی حەمەدۆڵ.

❖ کوڕە لە دایکی پرسی ئەرێ دایە بەڕاستی چەند مێردت کردووە؟ کوتی: وەڵـلا ڕۆڵە خێر و خۆشیم لە خۆم نەدیوە، نۆ لەم هۆزی، نۆ لـەو هـۆزی، نـۆ لـە زینـوێ برایمـە بۆزی، نۆش لە بەر تاو خویان دەدۆزی، ڕەحمەتێکەی بابی تۆ، لەبەری ئالان سێ یـا دوو، ڕۆڵە دەستم بە هەویرە، هەر ئەوەندەم بە بیرە.

❖ لە کابرایان پرسی ئەوە بۆچی گۆرەوییەکانت لینگێک سوور و لینگێک شـینن؟ کوتی: ئەسقەزا لەماڵێش جووتێکی دروست بەو جورەم هەیە.

❖ مەلا ئەحمەد عەبباسی گێڕایەوە: لاوێکی جوانچاک کە لە ئەولیاهولـلا بـوو بـە میوانی لایدا دێیەک و بە مەلای کوت: ئەگەر ئەمشەو ئەسیدەم بۆ لێنێی میوانـت دەبم، مەلا کوتی: بڕۆ کاکە میوانی چی و ئەسیدەی چـی؟ شـەو مـەلا تـا بـەیانی خـەونی بـە سەتوبیست و چوار هەزار پێغەمبەر و پیاوچاکـەوە دی و بـۆ بـەیانی زانی کـە ئـەو لاوە نەزەرکردە و گەورەیـە بـە پەلـە خـۆی گەیانـدێ و کـوتی: ئەگـەر ئەمشـەو میـوانم بی ئەسیدەت بۆ لێدەنێم، لاوە کوتی: بڕۆ مەلا! ئەو شەو بۆ ئەسیدەیەک سەتوبیستوچـوار هەزار پێغەمبەر و پیاوچاکت هەراسان کرد.(ئەسیدە جورێک هەڵوایە)

❖ ڕەحمانی وەستاقادر لە دیوالانی سەردەشت ماوەیەک ببو بە سـۆفی گۆشـەی مزگەوت جومعانـە لـە کـاتی خوێنـدنی خوتبـەدا جـوابی مامۆسـتای دەداوە، دڵـی بـە کچێکەوە بوو نێوی ئامین بوو، ئەویش مەمنا هەر فکری لە سەر ئامین بوو زۆر جـار لێـی

تێک‌دەچوو دە جوابی مامۆستادا لە باتی ئەوەی بڵێ ئامین یا ڕەببەلعالـەمین، دەیگـوت: ئامین ئامین یا ئامین.

❖ دوو برا بوون لە مامکاوێ تەمەنیان لە شێست‌ساڵ تێپەڕیبوو، ژنیان نـەهێنابوو. یەکیان بە خروێکە چاوی کوێر ببوو. سەرجەم پازدە سەریان بـزن هـەبوو بـۆ ئـەو پـازدە بزنە نۆ سەگیان ڕاگرتبوو. لە بەندەنێ بـزن و سـەگ تێکـەڵ دەبـوون و سـی چـل سـەر دەهاتـە بەر چاو سۆفی ئەحمەد لە نێو دێی پێـنج شـەش کـوڕی بـوو. ڕۆژێـک بـە بـرا چاوساغەکە دەڵێ: کوڕە ئەتۆ بـۆ ئەوەنـدە بزنانـە ئەوەنـدە سـەیانەت بـۆ چـن؟ ئـەویش دەجوابدا دەڵێ: جا سۆفی ئەوە قسەیە بـە مـنی دەڵـێی؟ ئـەدی بـۆخـۆت ئـەو هـەموو کوڕانەت بۆ چن؟ (داوداوێ و مامکاوێ دوو دێی نزیک ساوان و دۆڵەتوێن).

❖ کابرایەک دە قسەکردندا زمانی دەگیرا و بە دوای «پ»دا «ن»ی بۆ نـەدەهات، زۆری ئیشتیا لە پەنیر بوو ڕۆیشتە دووکانی ماست و پـەنیر فرۆشـی و کـوتی: کیلۆیـەکم پەپەپە.... فایدەی نییە، بە زیادم نەکرد ماست دەیە.

❖ ساڵی ١٣٧٥ معاوینی قوتابخانەی حافز بووم و یۆنسـی مووسـازادە مـدیر بـوو؛ ڕۆژی ٧٥/١٢/٢ یـەکێ لـە مامۆسـتاکان دەچێتـە لای یـۆنس و دەڵـێ: چەنـد ڕۆژە لـە کلاسی دووەمی یەک، سیزدە غایبە. ئەویش بە ناڕەحەتی هاتە لام و کـوتی: براڵـە ئـەوە چ وەزعێکە؟ معاوینی کوا وا دەبێ؟ ئـەوە چەنـد ڕۆژە سـیزدە نەفـەر لـە کلاسـی دووەم غایبن و نایەنەوە مەدرەسە و تۆ لێیان ناپرسـیوە، منـیش بـە بـێ‌بـاوەڕی چـووم و سـەر حیسابی قوتابییەکان بووم، دیتم تەنیا ڕەحیمی سێزدەی شیلاناباذی غایبە، جـا توخـودا کەی ئێوە بڵێن سیزدەش بوو بە شۆڕەت؟

❖ سەعیدخانی هومایوون گێڕایەوە: لە دێی ئەحمەداوای بۆکان مستەفا شێتێکی لێبوو مچەشێتیان پێدەکوت. دە دڵی خۆیدا ئاشقی ئەختەری کچی ئەحمەدبەگ بوو و زۆر بە حەسرەت لێی دەڕوانی. ئەحمەد بەگ جار و بار مچەی بانگ دەکردە ژووریَ و ئەختەری بانگ دەکرد دەیکوت: دانیشە با مچە سەر بخاتە سەر ڕانت، کاتیَ مچە سەری دەخستە سەر ڕانی ئەختەر، ئەحمەد بەگ داوای لە ئەختەر دەکرد سەری مچەی بخورێنیَ، مچە دمو حاڵەدا دەتکوت لە سەر هەورانە، دمو دەمەدا ئەحمەدبەگ بۆ ئەوەی ئەو عیشقە لە مێشکی مچە بباتە دەر دەیکوت: جا مچە گیان لە ئەختەری گەڕیَ بڕۆ بە نێو دێیدا بگەڕیَ کچێکی بە کەیفی خۆت ببینەوە جا من دەچم خوزابێنیت بۆ دەکەم، دەهۆڵ و زوڕنای بانگ دەکەم، بەڕمبازێن و ڕەشبەڵەک بووکت بۆ دەگوێزمەوە و هەموو خەرجی زەماوەند و دوای زەماوەندیشت وە عۆدە دەگرم. مچە هەموو جاران ئاخێکی قووڵی هەڵدەکێشا و دەیکوت: توخوا ئاغا لێمگەڕیَ ئی خۆم خاسترە.

❖ مام ڕەزاق یەکە پیاوی بنەماڵەی قازی و دۆستی نزیکی بابم بوو و لە قزلجە دادەنیشت و هەتا بڵێی دممار پیاو و دلاوا و بەهەیبەت بوو. ساڵی ٤٥ لە ئەسپ داکەوت و لاقی شکا و بەجیَ و بان کەوت. پاش چەند ڕۆژ حوسێنی ئەحمەدی شێخەی چوو سەردانی، وەختایەک بەو جۆرەی چاو پێکەوت لە جیاتی ئەوەی بۆی نارەحەت بیَ و هاوخەمی خۆی دەربڕیَ، دەستێکی بە چەنەی داهێنا و کوتی: یارەببی زۆر شکور لاقت شکاوە و ناتوانی لە جێی خۆت بجووڵێیەوە، مام ڕەزاق ڕەنگێکی هێنا و برد و هۆی ئەو قسەیەی لیَ پرسی، مام وسێن کوتی: وەڵلا دوێنیَ کاکت دەگەڵ کەسێک بە شەر هاتووە و ئەو کابرایە لە زاری خەڵەتاوە و چەند قسەی سووکی بە کاکت کوتووە دڵنیام ئەگەر لاقت وا نەبایە ئاورێک هەڵدایسا و تووشی پیاوکوشتنیَ دەبووی بەڵام دیسان خوا

شکور لاقت شکاوە و بێ دەسەڵاتی و ئەو بەڵایەت لێ دوور بووەتەوە، مام ڕەزاق ئەو قسەی پێخۆش بوو و مام وسێنی خەڵات کرد.

❖ مام کەریمێک بوو لە سوێناس شکایەتی لە حاجی حەمەداغا کرد. ژاندارم هاتن حاجی حەمەداغایان بردە پاسگای گوێچکەدەرێ، بەڵام لەوێ مام کەریم مەحکووم بوو، دوو قۆڵی بەرەو سوێناس گەڕانەوە. کاتێ گەیشتنەوە ئاوایی هەواڵیان دانێ گایەکی مام کەریم مندار بووەتەوە، حاجی حەمەداغا ڕووی دە مام کەریم کرد و کوتی: ئێستاکە شکایەتت لێکردووم و مەحکووم بووی و گات لێ مندار بووەتەوە پچۆ دە تەوێڵەی منەوە سێزدە گای تێدایە یەکیان بە کەیفی خۆت هەڵبژێرە دەنا ئەو ساڵ بەلینگەگایەک جووتت بۆ ناکرێ.

❖ میوانێک لە ماڵە برادەرێکی کە دایکێکی پیری بوو کوتی: بە دەستووری حاکم هەر پیرێژنێک بتوانێ دوو ڕبە گەنم لەو سەری حەسارڕا بەرێتە ئەو سەری حەسار، دەبێ مێردی بکا، بۆ سبەینێ ڕا کوڕەکە لە بازاڕ هاتەوە چاوی بە دایکی کەوت لە حاڵێکدا دوو ڕبە گەنمی ڕکێش کردبوو و گەیاندبوویە نێوەڕاستی حەسار، هەر کە چاوی بە کوڕەکەی کەوت وتی: ڕۆڵە دامەنیشە بە غار بچۆ لەو برادەرەت بپرسە بزانە بە خشکەش حەلەبە؟

❖ کوتی: بە ڕۆژوو بووم نەمزانی پڕمدا لیوانێکی ئاو و هەمووم خواردەوە، لە ناکاو وەبیرم هاتەوە بە ڕۆژووم، کوتم: پەککوو شکا. دایکم کوتی: نا، نەتزانیوە ڕۆژووەکەت نەشکاوە، شەوێ سێوێکم بە نەشۆراوەیی خوارد برا چکۆلەکەم لەوێ بوو کوتی: قەیدێ ناکا چونکی نەتزانیوە ئەو سێوە نەشۆراوەتەوە پێی نەخۆش نابی.

❖ لە پیرەپیاوێکم بیست کوتی: کاتێ نوێژ دەکەی دەگەڵ خوا قسان دەکەی، کاتێ کتێبەکەی دەخوێنیەوە خوا دەگەڵت قسان دەکا.

❖ خەیاتێک، دە کاتی ناشتنی کورتاندروویەکدا بە بانگ و سەلا دەگریا، لێیان پرسی چۆنە لە مەرگی کورتاندرو ئاوا داغداری؟ خۆ ئەو هاوکاری تۆ نەبوو، کوتی: با، بوو، هەرچی بوو وەک من ئەهلی تەقەڵ بوو.

❖ دزێکیان دا دەس مەعموورێک بیباتە لای قازی، گەیشتنە نزیک نانەواییەک دزە کوتی: مەردی خوای بە لەمێژە دە زیندان‌دام و ئارەزووی خواردنی نانێکی گەرمەتەندوور دەکەم، ئیزنم دە دەچم دەیکڕم و دێمەوە، پاسەوان دەستی کردەوە، دزە ڕۆیی بۆ نان کڕین و بە دەرکەی دیکەی نانەواییدا بۆی دەرچوو، پاشی قەدەرێک دزەکەیان گرتەوە دیسان دایانەوە دەستی هەمان پاسەوان تا بیباتە دادگا. کاتێ گەیشتنەوە ڕاستی نانەواخانەکە دزە ئاخێکی هەڵکێشا، مەعموورەکە کوتی: دەزانم بە تەمای چ بڵێی، بەڵام ئەو نۆرەی فریوت ناخۆم، دەستی دزەی کردەوە و کوتی: لێرە ڕاوەستە من دەچم نانەکەت بۆ دەکڕم.

❖ دوو قوتابی تەنبەڵ گەیشتنە یەک و دوای چاک و خۆشی کوتیان: وەرە با شێر و خەتێ بکەین. ئەو پوولەی هەڵداوێین ئەگەر شێر هات دەچینە سینەما، ئەگەر خەت هات دەچینە تۆپێنێ، ئەگەریش قیت لە سەر کەلەکەی چەقی دەچینەوە قوتابخانە.

❖ خێزانی حەسەنی مارفخانی نەخۆش کەوت، دوکتور و داو و دەرمان نەما لە

سەری دە کار نەکا بەڵام هەروا گاگۆڵەی دەکرد و پێی نەدەگرتەوە. ئاخری شەوێک کە دوستێکی میوانی بوو کوتی: ئاوا گوزەران ناکەم، ناچارم دەست ببزێوم و هەتا پیر نەبووم ژنێکی دیکە بێنم ئەو ژنە تازە چا نابێتەوە. ژنە وەختایەک گوێی لەو قسەیە دەبێ بۆ بەیانی لە داخان ڕاست دەبێتەوە و عەلەمی دە لەشیدا نامێنێ.

❖ وەستا عەولای فەرەیدوونی لە بیرەوەرییەکانی خۆی گێڕایەوە: وەختایەک منداڵ بوو چرا نەبوو، گایماڵێکی نەخۆش دەبێ و پیاو لە ماڵ نابن دەچن لە دوای پیاوی جیران بێ گایەکەیان بۆبکوژێتەوە نەکا مندار بێتەوە، تەویلە زۆر تاریک دەبێ، کابرا لە جیاتی گایەکە کەرەکە دەکووژێتەوە، بۆ بەیانی کە لە خەو هەڵدەستن و دێن تا گایەکە کەوڵ کەن، دەبینن کەرەکە کوژراوەتەوە و گایەکەش مندار بووەتەوە.

❖ سەید ئەحمەد محەممەدی گێڕایەوە: مناڵ بووین خالۆ سەدیق خەڵک بان هۆبەتوو شەوێک هات و میوانمان بوو. ئەو وەختە هەموو ماڵان ئەوپەڕی ئەگەر بایان کوورەی داریان بوو. ئەو شەوە خالۆ سدیقمان دە هۆدەی تایبەتی میوانانداندا خەواند و لێفەیەکی مەخمەری سوور کە تازە ببوو بە مۆد و دایکم یەکجار زۆری خۆش دەویست پێمان دادا، بەڵام کاتێ بەیانی هەستاین دیتمان خالۆ سەدیق بە دەم خەوموە لە کوورەکە نزیک بووەتەوە و لێفەکەی بە ئەندازەی کەشەفێک سووتاندووە، خالۆ سەدیق دە حاڵێکدا خەریکی بەر چایی خواردن بوو دەیکوت: بێژم خەم لێفەمە، خەم لێفەم نییە، هەزار لێفە بێت وە قوربان خۆم، خەم ئەمەمە پیاوێ وە من چۆن ئەشێ لێفە بسووتێنێ؟!

بەڵام دایکم کە زۆر نارەحەتی لێفەکەی بوو لە بەر خۆیەوە دەیبۆڵاند و دەیکوت: کوڕە هەزاری وەک تۆ بە قوربان ئەم لێفەیە بێ.

❖ کابرایەک بەیانییەکی زوو ڕۆیشتە لای شێخ و بە پەلە گوتی: یا شێخ دە خەونمدا بوو زستانێکی زۆر سارد بوو. لە فلانە شاخ ئاورێک کرابۆوە، منیش چووم و خۆم لە بەر ئەو ئاورە گەرم کردەوە، مانا و لێکدانەوەی ئەو خەونە چییە؟ شێخ گوتی: بڕۆ شوێنی ئاورەکە بدۆزەوە هەڵیقەنە زێڕی تێدایە. کابرا ڕۆیشت وای کرد و بە سەر زێڕێکی زۆردا کەوت و زۆر دەوڵەمەند بوو. چەند ساڵ گوزەرا شەو خەونی دی: سووری هاوین لە شوێنێکی ئاور کرابۆوە و ئەویش چووبوو خۆی بەو ئاورە گەرم دەکردەوە، بەیانی زوو بێ‌مەحتەل بوون ڕۆیشتە شوێنەکە و هەڵیقەند و بە سەر کەلاکێکدا کەوت تازە کوژرابوو و شاردبوویانەوە، دەسبەجێ مەعموور گەیشتنە سەری و قۆڵبەستیان کرد و بردیانە زیندان و زۆریان جەزرەبە دا، کابرا هەر هاواری شێخی دەکرد دە فریای بێ. کاتێ هەواڵیان بە شێخ دا، گوتی: ڕاست دەکا، ئەو کابرایە بێ‌تاوانە، چونکی نەیزانیوە کە خۆ گەرم‌کردنەوە بە ئاوری هاوین چ مسیبەتێکی بە دواوەیە.

❖ پیاوچاکێک عادەتی بوو تووشی هەر زاڵم و دڕندەیەک هاتبا نسحەت و ئامۆژگاری دەکرد و وشیاری دەکردەوە تا دەست لە خراپەکاری هەڵگرێت. ڕۆژێک تووشی گورگێک هات و دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنی: ئەی گورگ تۆ تاقەڕووحێکت دەبەردایە، ڕەوا نییە بۆ خاتری ئەو تاقە ڕووحەی خۆت، ڕووحی ئەو هەموو گیاندارانەی دیکە بخەیە عەزاب، واز بێنە، دڕندەیی وە لا نێ، خوێنخۆری و خوێنڕێژی ئاخر و ئاقیبەتێکی نییە، گورگ تا ئەو کاتە باش گوێی بۆ قسەکانی پیاوچاک شل کردبوو. لە ناکاو گوتی: پیاوچاک قسەکانت زۆر خۆشن، یا زوو کورتیان کەوە یا هەڵیانگرە بۆ وەختێکی‌دی. ئێستا بۆنی مێگەلە مەڕێکم لە پشت ئەو تەپۆڵکەوە بۆدێ، زوو نەیانگەمێ لە کیسم دەچن و دەم وێیانڕا ناگا. پێم خۆشە دوایە بتبینمەوە، ئامۆژگارییەکانت زۆر خۆشن.

❖ کاری قازی دادگایی کردنی تاوانبار و دیاری کردنی تەمبێ لە بەرامبەر تاوانەکەیەتی، ڕۆژێک قازی بۆخۆی تووشی تاوانێکی گەورە هات و حاکمی شار بۆخۆی بە سەر تاوانەکەدا چوو و قازی گرت و دەستووری دا چەند قازی دیکە ئەو قازییە دادگایی کەن. کاتێ ڕێ و ڕەسمی دادگایی کردنی کۆتایی هات، حاکم کوتی: ئەی قازی تۆ لای ئێمە ئەمینێ و باوەڕپێکراو بووی، حوکمی خەلات و تەمبێی خەڵکمان پێدابووی، ئێستا کە تۆ دەو بەرگ و لیباس و پلە و پایەدا تووشی ئەو تاوانە گەورە بووی، دەستوور ئەدەم بە زیندوویی کەولت کەن و کات دە پێستی باخنن و بە سەر دەروازەی شاردا هەڵتواسن تا ببی بە پەند و خەڵک دەرس و عیبرەتت لێوەرگرن. قازی ملی بە لارەوە نا و کوتی: ئەی حاکم تاوان من کردوومە و ئەمن دەبێ پەند و دەرس و عیبرەتێ وەرگرم خەڵکی بێچارە چییان کردووە تا پەندی وەرگرن؟ باش وایە دەستوور بدەی یەکێکی دیکە وا لێبکەن تا من ببینم و بترسم و پەند و دەرسی وەرگرم و جارێکیدیکە هەڵەی وا دووپات نەکەمەوە.

❖ شێتێک ڕۆیشتە ماڵی شێتێکی دیکە، پێکەوە دانیشتن و دەگەڵ یەکتر کەوتنە وتووێژ:

ـ ئەرێ ئێوە لە ماڵ چالاوتان هەیە؟

ـ ئەی چۆن! ئەرێ وەڵلا هەمانە.

ـ ئەی ئەگەر چالاوتان هەیە کوا؟

ـ هەمانە بەڵام هێشتا هەڵمان‌نەکەندووە.

❖ کوڕێک دەگەڵ دایکی ڕۆیشتنە خوازبێنی پەروانە خانم. کاتێ بووک دەورێک چای بە پێش میوانەکاندا گێڕا و گەیشتە ڕاستی دایکی زاوا، دایکی زاوا ناوی بووکی

باش نەدەزانی کوتی: زۆر سپاس پەرستوو خانم. برای بووک هەڵیدایە: پەرستوو نییە، پەروانەیە. دایکی زاوا خۆی نەشکاندەوە و کوتی: مەسەلەیەک نییە، پەرستوو و پەروانە هەردووکیان حەیوانن.

❖ مسابەقە و گرۆی هەلاتن واتە دمو بوو، دەستەیەک خەریکی غاردان و هەلاتن بوون. ناشارەزایەک پرسی ئەوە چ باسە؟ کوتیان: ئەوەدەستەیەکن ڕا دەکەن، هەرکام نەفەری یەکەم بێتەوە خەڵات و جایزەیەکی باشی دەدەنێ. کابرا سەریکی ڕاوەشاند و کوتی: باشە نەفەری یەکەم بۆ وەرگرتنی خەڵات و جایزە ڕادەکا ئەوانی دیکە بە چ حیسابێک خۆیان ماندوو دەکەن؟

❖ کوڕێک زۆر تەنبەڵ و لاسار بوو دایکی لە دەستانی جاڕز بوو کوتی: ڕەببی ڕۆڵە شێر تێکت بشکێنێ، کوڕە کوتی: دایە گیان هیچ خۆت ماندوو مەکە و دوعای خۆڕایی مەکە قبووڵ نابێ. دایکی کوتی: جا چۆن؟ من دایکم و بێشک دوعام قبووڵ دەبێ. کوڕە کوتی: بۆ ئەوەی کەسێک شێر تێکیبشکێنێ دەبێ بچێتە شاخ و کێو و لێرەوار تا لە ڕاست شێرڕا بێ جا ئەو وەختە شێرەکە تێکیبشکێنێ؛ من کاری خۆم دیوە هەتا ئەو کورسی و پاڵ تەندوورە هەبێ من ئەوە لێرەم و نابزووم و شێریش لێرە دەستی پێم ڕاناگا.

❖ خوانچکە لە بەرەوەی قەلادزێیە. حەمەد مەمۆ کوتی: پایزی سریجێ گێڕایەوە: کابرایەک لەو دێیە نۆ گای دەبێ و گایەکیش لە جیرانێکی وەردەگرێ و گێرەی دادەبەستێ، وەختی گێرەبەردانێ تەماح دەیگرێ و دەڵێ: هەموو ڕۆژێ وام بۆ هەڵناکەوێتەوە گای خەڵکم لە لا بێ، وا باشە جارێ گێرەی بەر نەدەم ئەو ڕۆ غەنیمەتە

بەڵکوو تا ئێواریٚ خلاسیم بیٚ و خۆیانەکەم لە گێرە دەرچیٚ، جێیەکە زۆر حەستەم دەبیٚ، لایەکی دەروانێتە چۆمی زێیە، گای لابار زۆر تینوو دەبیٚ و لە وەعدەی ئاودانی رۆژانەی تێدەپەڕیٚ، لە تینوان لە ناکاو لەو بڵیندایەڕا خۆ هەڵدەداتە نێو چۆمی زێیە و هەموو گایەکانی دیکەش بە دوای خۆیدا هەڵدەدێریٚ و حەیاتیان لێدەبڕیٚ، جا لەو کاتەوە کوتوویانە: نۆ گای خۆی بە گایەکی خەڵکێوە خنکاند.

❖ حوسێن پەزە دەلاڵی مەڕ و مالات بوو، رۆژانە لە مەیدانی حەیوانان رادەوەستا و دە سەودا و معامەلەی خەڵکدا قسە و بەشداری دەکرد و پێکی دێنان و پوولێکی لێوەردەگرتن، رۆژێک کابرایەکی لادێیی مانگایەکی بۆ دێنیٚ و دەڵیٚ: کاک حوسێن دەستم بە داوێنت بەدادم ڕانەگەی ماڵوێران دەبم، دارایيم ئەو مانگایەیە بەلام بەختی بەدی من تەلی قووت داوە و دەورگی هەڵچەقیوە حەوتەیەکە دەمی لە لەوەڕ نەداوە دەزانم لێم مندار دەبێتەوە هەرچۆنی دەتوانی بۆم بفرۆشە و ئەو زەرەرەم لێخەکەوە. حوسێن پەزە مانگاکەی لیٚ وەردەگریٚ و دە نێو مەیداندا مل لە تاریفاتی دەنیٚ، ئەو مانگایە لەو کوردوستانە بیٚ وێنەیە، تا ئێستا هەرچەند جاری زاوەدووانەی بووە، شیری بە قەت سیٚمانگایان تێدایە، سەربەڕسقە،... بەکورتی هێندە تاریفی دەکا مشتەرییەک حازر دەبیٚ بە قیمەتێکی باش بیکڕیٚ، بەلام خاوەن مانگا کە ئەو ماوەیە گوێی بۆ تاریفاتی حوسێن پەزە هەڵدەخا، دێتە پێش و لە فرۆشتنی پەشیمان دەبێتەوە و دەڵیٚ: ماڵت ئاوەدان بیٚ کاک حوسێن ئەوە حەقە دەلالیت من تا ئێستا نەمدەزانی ئەو مانگایەی من ئەوەندە باشە، بابم کا حوسێن نایفروشم.

❖ بەیانییەک زوو حوسێن پەزە و حوسێن گەلە لە ڕاست یەکڕا دێن، حوسێن پەزە دوای چاک و چۆنی ڕوو دەکاتە حوسێن گەلە و دەڵیٚ وەرە با بچینە حەمامی

شوجاعولمولک و خۆمان بشوێن، حوسێن گەلە دەڵێ: حـەمامی چـی؟! چوونـە حـەمام دوو قڕانی خەرجە من دەو دنیایەدا قڕانێک شک نابەم، حوسێن پەزە دەڵێ: هـیچ نییـە، با بچین من پووڵی حەمامەکەت بۆ دەدەم؛ بەو شەرت و قەرارە پێکـەوە دەچنـە حـەمام، حوسێن پەزە زوو خۆی دەشوا و خواحافیزی لـە حوسـێن گەلـە دەکـا و دەڵـێ: تـۆ بـە کاوەخۆ خۆت بشۆ من پووڵەکەت بـۆ دەدەم. دێتـە دەر و لیباسـی دەکاتـەوە بـەر و دە کاتی وەدەرکەوتندا بە حـەمامچی دەڵـێ: حوسـێن گەلـە پووڵـی منـیش دەدا، بـەڵام حوسێن گەلە کە پێی وا دەبێ حەمامی مفتێی وە گـیر کـەوتووە زۆر بـە کـاوەخۆ خـۆی حەمام لە میش دەکا، کاتێ تەواو دەبێ و دێتە دەر و لیباسی دەبەر دەکاتەوە و دەیـەوێ هەروا بڕوا حەمەدی حەمامچی پێشی پێدەگرێ و داوای پووڵ حـەمامی هـەر دووکیـانی لێدەکا، کاتێ حوسێن گەلە دەزانێ فێڵی لێکراوە، سوێند بۆ حەمەدی حەمامچی دەخـوا کە تاقەقڕانێکی پێ نییە، هەرچۆنێ دەبـێ مۆڵـەت دەدرێ و وەدەر دەکـەوێ، ئەوانـەی ئاگایان لێبووە گێڕایانـەوە بـۆ پاشـنوێژێ حوسـێن گەلـە و حوسـێن پـەزە لـە مەیـدانی ئاسینگەرانی مەهاباد کە ئـەو کـات مەیـدانی حـەیوانان بـوو لـە ڕاسـت یـەک ڕاهـاتن، ئەوەندەیان یەکتر کوتـا و یـەکتریان دەخـۆڵ و پـەین و پاڵـی مەیـدان وەردا ئەگـەر دە حەمامی دیکەیان کردباوە خاوێن نەدەبوونەوە؟

❖ دوو کەس بە ئیعدام مەحکووم دەکـرێن، داوایـان لێدەکـەن دوایـین ئـاوات و داخوازییان بڵێن تا بۆیان بە جێ بێنن، یەکەمی دەڵێ: دوایین ئاواتم ئەوەیە بـۆ دوایـین جار چاوم بە دایکم بکەوێ، دووهەمی دەڵێ: دوایـین ئـاواتم ئەوەیـە کـە ئـەو هاوڕێیـەم چاوی بە دایکی نەکەوێ.

❖ ساڵی ١٣٧٥ کوردێکی خەڵـکی شـاری سـولەیمانییە دە شـەوی ساڵـوەگەڕی

کۆچی دوایی ئیدیسۆندا ڕێی دەکەوێتە وڵاتی ژاپۆن لەپڕ بۆ ماوەی دەقەیەک کارەبا و چراکان دەکوژێنەوە و ئەو دانیشتووانەی بە دەوریەوە دەبن هەموو بێدەنگ دەبن، کە کارەباکە هەڵدەبێتەوە دەپرسێ کە چۆن بوو کارەباکەتان کوژاوە؟ ئەوانیش تێیدەگەیێنن کە ساڵەوەگەڕی مەرگی ئیدیسۆنەو هەموو ساڵ دەو کاتەیدا بۆ ماوەی دەقەیەک کارەبا دەکوژێتەوە و ئێمە بێدەنگ دەبین و سکووت دەکەین و بەو کارەمان ڕێز لە رووحی بەڕێزی ئەو مەزنەپیاوە دەگرین. کوردە دەڵێ: دیسانیش بژی کوردستان، بژی وڵاتی خۆمان کە بێ وەبەرچاو گرتنی ساڵوەگەڕ و ئەو جۆرە شتانە، دە شەو و ڕۆژدا بە لانی کەمەوە بۆ ڕێزگرتن لە ڕوحانەتی ئیدیسۆن سێزدەسەعات کارەبامان دەکوژێتەوە.

❖ فەسلی گەیشتنی هەناران بوو، دەستەیەک ژن لە یەکێک لە ئاواییەکانی ئالانێ کۆ ببونەوە یەکیان گوتی: بە زیادم نەکرد هەنار! ئەورۆ سێ جارم دەست و دەم و چاوی منداڵەکەم شوشتۆتەوە، ئەوی دی هەڵیدایە گوتی: تۆ دەڵێی چی؟ من دوێنێ مەسینەم دەس داوەتێ هاتوومە دەرێ دم و چاوی پازدە منداڵانم شوشتووەتەوە تا منداڵەکەی خۆمم ناسیوەتەوە.

❖ کوڕێک ئاواتی بوو بابی ژنی بۆ بێنێ بەلام هەرچی دەیکرد لە ڕووی هەڵنەدەهات ئەو ئاواتەی لە لای باوکی بدرکێنێ. ئاخری برادەرێکی فێری کرد: ئەمشەو کە لە لای باوکت دەنوی خۆت دەخەو خە و پاش هەرپرخەیەک بڵێ ژن، بەو جۆرە شەو کوڕەکە بە قسەی برادەرەکەی کرد و دەگەڵ هەموو پرخان بە پاشدەنگ دەیگوت: «ژن». باب، بەو پرخ و هۆڕە وەخەبەر هات و گوێی هەڵخست و کاتێ دە مەبەستی کوڕەکەی گەیی ئەویش خۆی دەخەو خست و پرخاندی دوای هەر

پرخەیەک پاشدەنگ دەیکوت: «فچ».

❖ کابرایەک ژنەکەی زا و کوڕێکی بوو، ڕووی دە خێزانی کرد و ئاخێکی هەڵکێشا و کوتی: خۆزگە ئافرەت زانیبام شێخ ئەبووبەکری نێزێ ناوی چی بووە؟ ژنە پرسی: بۆ؟ کابرا کوتی: ئەگەر زانیبام ناوی چی بووە ئەو کوڕەم بە ناوی ئەو دەکردەوە.
(نێزێ و گەرۆر دوو دێی بەرامبەری میراوێ مەلاخەلیلن مەرقەدی شێخ ئەبووبەکر لە نێزێیە).

❖ هەتا گندۆرگندۆر بوون، خزمی گندۆرە زۆر بوون، گندۆر هاتە بڕانێ، خزم کەوتنە قڕانێ.

❖ کابرایەکی خەڵکی سەرووچاوێ بە سەفەر دەچێتە بەغدا و لە شەقامێک لە ڕاست ئەنوەربەگ ڕا دێ، ئەنوەربەگ دەڵێ: سەیە ئەوە لێرە چدەکەی؟ کابرا لە خۆشی ئەو قسەیە بە پەلە سواری سەیارە دەبێ و بەرەو سەروچاوێ دەگەڕێتەوە، لێی دەپرسن بۆ وا زوو هاتێوە؟ وا دیارە نەچوویە بەغدا! ئەویش دەڵێ: بەرێوەڵلا چوومە بەغدا و میریشم لەوێندەرێ دیتییە، ئەوانیش بە بێباوەڕێ دەڵێن: لەو قسانە بەوە، ئەو قسەیە لە دەمی تۆ زیادە، میرم دیتییەوەڵلا قسەی بێتام!
ئەویش زۆر توند و دەخۆڕا دیوانە دەڵێ: وەڵلا وەڵلا میرم بە چاوی خۆم لە بەغدایە دیتییەئەویش بە لەفزی خۆی بە من گوت: سەیە ئەوە لێرە چ دەکەی؟

❖ مامەنداغا مالیک و ئاغای شەختانێ بوو، شەختان لە نێوان مەهاباد و پیرانشار هەڵکەوتووە، بەڵام لە پیرانشار نزیکترە. چەند ساڵ مەعموور لە پیرانشار ڕادەچوون بۆ وەرگرتنی مالیات و سەربازگری، مامەنداغا دەیکوت: ئێمە سەر بە مەهابادین و مالیات

و باجم داوە بە مەهاباد، لە مەهابادیش ڕا کە مەعموور دەچوون دەیکوت: مالیاتم داوە بە پیرانشار، بەو جۆرە چەند سالی بەو جۆرە ڕابوارد و خۆی و خەلکی دێیەکەی لە دانی مالیات مەعاف کرد.

❖ دزێک لە شەقلمێکی چۆل پڕی دا کیفی ژنێک و ڕای‌کرد، ژنە دەستی بە قیژ و هەرایە کرد: ئای دز، ئای دز، دزە دیتی ئەگەر بێت و ژنە هەروا درێژە بە قیژ و هەرایە بدا خەلک و مەعموور دەگەنە سەری و دەیگرن، بە تووڕەیی گەڕاوە سەر ژنەکە و کیفەکەی بە دمی داداوە و کوتی: ها بیگرە، نەدی‌وبدی، دەلێی قەت دزت نەدیوە!

❖ کابرا شەو دە جێی خزا بنوێت کێچێک هاتە جەستەی و دەردی دایە، زۆری ئەو دیومودیو کرد و چرای هەلکردەوە ئاخری هەرچۆنێ بوو کێچەکەی گرت لە خۆشییان هاتە کولان و هەڕای کرد: گرتم، گرتم، خەلکی دێ وایانزانی دزێکی مەترسیداری گرتووە بە دار و بەر چیغەوە هاتنە یارمەتی و کوتیان: کوا کێت گرتووە؟

کابرا دوو قامکی هێنا پێش و کوتی: کێچ، کوتیان مالنەوێران جا گرتنی کێچ ئەو داد و هاوارەی دەوێ؟! کابرا تووڕە بوو و قامکی لێک کردەوە و کێچەکەی بەرەلا کرد و کوتی: ئەو کارەی من بە کەم مەگرن، من بە تەنیایی ئەو کێچەم گرتبوو دە بڕۆن من بەرەللام کرد ئێوە پیاو بن بە هەمووتان بیگرنەوە.

❖ کابرایەک بوو لە بیستنی ناوی دۆلمە (یاپراغ) تووڕە دەبوو و بەردەوام خەنجەری دەبەر پشتێندی دابو و سوێندی خواردبوو هەرکەس بە لایەوە باسی دۆلمە بکا بیکوژێ، ڕۆژێک لە چایخانەیەک دادەنیشێ چەند کەس لەوێ دەبن، یەکیان دەلێ: برینج، یەکیان دەلێ لەپە، یەکیان دەلێ ڕۆن، یەکیان دەلێ زەردەچێوە، یەکیان

دەڵێ: شویت، ئاخری هەموویان دەڵێ گەلامێو، کابرا خەنجەرەکەی لە بەر پشتێندی دێنێتە دەر و لە سەر مێزەکەی پێش خۆی دەیچەقێنێ و دەڵێ: دەی ئەو جار پیاوم دەوێ هەڵیبەستێ (بیپێچێتەوە).

❖ هەتیوێکی شەڕانی زڵلەیەکی لە کەیخودایەک دا، کەیخودا دووسەتمەنی پووڵ دایە، کوتیان ئەو هەتیوە لە تۆی دا بەڵام تۆ پووڵت پێدا؟! کەیخودا کوتی: بەو دوو سەتمەنە هیلاکم کرد، تازە زاری شیرین بوو وا دەزانێ لەمەو بە دوا لە هەرکەس بدا پووڵی دەداتێ، بەو جۆرە هێندە دەگەڕێ و دەوەشێنێ تا دەگاتە پیاوی خۆی.

❖ کوڕێک لای بەززازێک بەردەست و شاگرد بوو، پاشی ماوەیەک ئاشقی کچێک بوو، ڕۆژێک کە خاوەن دووکان لەوێ نەبوو کچەکە هاتە لای و دوای تۆ خۆش و مـن خۆش کچە دڵی کەوتە سەر کوتەپارچەیەک و کوتی: بۆ دەسرەجوانە، کوڕەش لە لایەکەوە دەسەڵاتی بەخشینی ئەو کوتەپەڕۆیەی نەبوو لە لایەکی دیکەشەوە نەیدەتوانی دڵی دڵدارەکەی لە خۆی بێشێنێ پووڵیشی نەبوو بیخاتە نێو داخڵییەکەی و بڵێ فرۆشتوومە، دە ئاخریدا کوتەپەڕۆکەی دا بە کچەکە و ڕازی بەڕێی کرد، بەڵام دوای ڕۆیشتنی کچەکە کەوتە فکر و خەیاڵات کە ئەگەر بەزاز هاتەوە بڵێم ئەو پەڕۆیەم چ لێکردووە؟ لەپڕ فکرێک کەوتە مێشکی، پۆلوو ئاورێکی دە نێو پارچەکان هاویشت و دووکانەکەی داخست و ڕۆیشتەوە ماڵ تا ئەو کاتە ببوو بە شەو، ئاور وردەوردە خۆش بوو دووکان بە تەواوی ئاوری گرت و پێوەچوو ڕێزە دووکانێک بەو دووکانەوە ئاوریان تێبەربوو و سووتان. لەو کاتێوە کوتوویانە: بۆ دەسرەیەک قەیسەرییەک مەسووتێنە.

❖ سوالکەرێک بۆ سواڵ ڕۆیشتە دەرکی ماڵێکی دەوڵەمەند و داوای یارمەتی

کرد، ژنی خاوەن ماڵ لە نهوومی سەرەوەی خانووبەرەکەڕا کوتی: ئەگەر لە خوارێ بایەم شتێکم دەدایەی، سوالکەر ڕۆیی پاشی چەند ڕۆژ گەڕاوە و داوای یارمەتی کردەوە ئەو جار خانم لە خوارەوە بوو ڕووی دە سوالکەرەکە کرد و کوتی: خوا بتداتێ، حەیف لە خوارێم ئەگەر لە سەرەوە بام شتێکم دەدایەی، سوالکەر خێسەیەکی لێکرد و کوتی: بڕۆ بڕۆ بە زیادم نەکردی سەر و خوارتم دی چ فەرقێکی نەبوو.

❖ بە ڕەحمەت بن تا بابم مابوو هاتوچۆمان دەگەڵ حەمەدی بایزاغای نەک هەر زۆر بەڵکوو یەکماڵ بووین، حەمەداغا نۆکەرێکی بوو عەجەب ئیفادەیەکی لێدەدا و لەوەی نۆکەری حەمەداغا بوو خۆی چەندگەز لە خەڵک ژوورتر دەزانی و سەیر لە خۆی دەفشی، ڕۆژێک حەمەداغا دەڵێ: دا کوڕە بڕۆ گوێدرێژێ وە پێش خۆت دە پچۆ شار دوو سەوە ترێیان بکڕە و بیانهێنەوە، نۆکەر دێتە شار و دووسەوەترێی دەکڕێ و لە پشتی گوێدرێژەکەیان قایم دەکا و لە نێو بازاڕڕا بەرەو هەمزاوا دەگەڕێتەوە، لەو سەری بازاڕ کابرایەک ئاگای لە خۆی نابێ گوێدرێژ بە بارەوە خۆی لێدەدا و کابرا دەکەوێ، هەڵدەستێتەوە و بە تووڕەیی دەڵێ: بابم چ باسە؟ بە لانیکەمەوە هەرایەک، خەبەردارێک، ئاخر چۆن وا دەبێ؟ نۆکەر لە بیستنی ئەو قسەیە تووڕە دەبێ و دەست دەبەر کەلەکەی دەنێ و دەڵێ: ئائا بە سەری بابت بە هەویابە، دوو کاران چلۆن وێکڕا بکەم؟ نۆکەری حەمەداغاش بم و خەبەرداریش لە بۆ تۆ بڵێم؟

❖ بابێک ڕووی دە کوڕەکەی کرد و کوتی: دا هەستە بچۆ ئەو ماڵە جیرانەی سەنگ و بەردەکەیان بێنە با ئەو گەنمەی بکێشین، دەو وەختەدا پشیلەکەیان لە دەرەوە ڕا هاتەوە ژوور، کوڕە کوتی: بە لانیکەمەوە دە جار ئەو پشیلەیەم بە تەرازوو کێشاوە مەنێک (سێ کیلۆ)ی تەواوە، پشیلەکەی دە تەرازووی نێ سەت لە بەردی وان

چاترە، باب کوتی: بڕۆ نیو گەزەکەیان بێنە بزانم دایکت چەندی لە مافوورەکە چنیوە؟ کوڕە کوتی: بیست جار پێواومە ئەو پشیلەیە لە گوێچکەی ڕا هەتا سەری کلکی نیوگەزی تەواوە، بە پشیلەکە بیپێوە بۆچی لە خۆڕا بچمە مالان؟ باب کوتی: دەجا سەرێک دە دەرێ نێ بزانە باران دەبارێ یا نا؟ کوڕە کوتی: دەبینی پشیلەکە تازە لە دەرێڕا هاتەوە ژوورێ ئەگەر باریبا پشتی تەڕ دەبوو دەبینی ئیشک و برینگە کەوا بێ چوونە دەری ناوێ نابارێ، باب بە نارەحەتییەوە کوتی: کەوایە هەستە ئەو کیسە تووتنەم بۆ بێنە باقەننەیەکی تێکەم، کوڕە دیتی هیچ عیلاجی نییە و دەبێ هەستێ، بە نابەدلی ڕاست بۆوە و کوتی: بە زیادم نەکرد ئەو ژیانە دمو مالەیدا هەرچی کاری گرانە بە منی دەکەن.

❖ کابرایەک لە ... نەخۆش کەوت، ئەو کاتی هۆتێل و مسافیرخانە نەبوون و هەرکەس ڕێی کەوتبا شار ناچار بوو ناسیاوێکی بۆخۆی ببینێتەوە، وەختایەک هێنایانە سابلاغ و کاکم و وان بردیانە لای دوکتور شافعی، دوکتور معاینەی دەکا و هێندێکی داو و دەرمان بۆ دەنووسێ و دەلێ: بەو جۆرەی بیانخۆ چا دەبیەوە، بەلام پاش مانگێکی دیکە سەرێکم لێهەلێنەوە بزانم چۆنی؟

نەخۆش دەرمانەکان وەردەگرێ و دەڕواتەوە ئاوایی و دەستووراتی دوکتور بە جوانی بە جێ دێنێ و چا دەبێتەوە و پاشی مانگێک دێتەوە لای دوکتور و دەلێ: دوکتەر مالت ئاوەدان بێ، بەسەری تۆ لەوەتی دەرمانەکانم دە کار کردوون ئێش و عەلەمم دە قالبەندیدا نەماوە، سەت بریا خەلک وەک من زانیبایان تۆ چەندە گەورەی، دە بەو سەرەی خۆم بە دەست من بایە نەمدەهێشت جێت لەو جێیانە بێ، ئەمن دوعایەکت بۆ دەکەم وەکی ئێش و ئۆفت لە قالبەندی من بڕی یارەبی هێندە بالادەست بی ببی بە ڕەئیس پاسگا.

❖ لە دۆڵەتوێ لە مەجلیسی خزماندا بووم باسی ژن هێنانەوەی یەکێک بوو لە حازریان کەسێک کە دە درێژەی تەمەنیدا بە کوێرمووەری و دە ژێر سایەی زڕبابدا گەورە ببوو کوتی: فلانی واز بێنە تازە لەبەر ئەو مندالانە ژن مەهێنەوە با ماڵیان لێ نەشێوێ، من کە تا ئەو تەمەنەی هاتووم زۆرم نارەحەتی بە سەر هاتووە زۆرم بەدبەختی دیوە بەڵام هیچ شتێکم لە مشەمشی زڕباب و نازونووزی زڕدایکی پێ ناخۆشتر نەبووە.

❖ عەولای بایزاغای مەزن عاشیرەتی عێلی مەنگوڕ بوو و زیاتر لە میریسێ کە یەکێک لە دێیەکانی مەهابادە دادەنیشت، کابرایەکی دڵپاک و ساویلکە لەو عێلە دەچێتە حەج و بەو جۆرە دەپاڕێتەوە: خوایە گیان لە بۆ خۆت دەزانی لە وڵاتی مە هەرکەس کارێکی بیلعەت و ناجەیاز بکا خۆی دە ماڵی عەولاغا داوێ و کارەکەی کۆتایی پێدێ و ئاوێک بە سەر ئاورەکێیدا دەکرێ، هەر کە عەولاغا بەخشی ئیدی کەس ناوێرێ خۆی تێبگەیێنێ، ئێستاش خوایە ئەمن هەرچی کاری بیلعەت و ناجەیازە کردوومە و خۆم دە ماڵی تۆ هاویشتووە، جا خۆ ئەتۆ و عەولاغاشیان نەگوتووە، وەختایەک ئەو ببەخشێ جا چلۆن ئەتۆ نابەخشی؟

❖ ساڵی ١٣٥٨ ئامبۆلانسی نەخۆشخانەی مەهاباد نەخۆشێک لە مەهابادڕا دەباتە یەکێک لە خەستەخانەکانی تەورێز و لەوێڕا بە بەتاڵی دەگەڕێتەوە، لە نزیک پۆلیس ڕێی میاندوواو ناسیاوێک دەست لە شۆفێری ئامبۆلانسەکە هەڵدێنێ و ئامبۆلانس ڕایدەگرێ و کابرای مسافیر دەچێتە پشتەوەی ئامبولانس، بەڵام زۆر کەم خەو و ماندوو دەبێ، دە نێو ئامبۆلانسەکەدا بڕانکادرێکی بەتاڵی تێدا دەبێ نەغد لە سەری درێژ دەبێ و پەتوویەک بە خۆیدا دەدا و خەوی لێدەکەوێ. پاش ماوەیەک لە نزیک بەردەڕەشان

دوو کەسی دیکە دەست لە ئامبۆلانسەکە هەڵـدێنن، ئـامبۆلانس ڕایـدەگرێ و ئـەوانیش دەچن دە پشتەوەدا دادەنیشن، کاتێ چلویان بە کـابرای درێـژ بـوو لەسـەر بڕانکادرەکـە دەکەوێ فاتیحایـەکی بـۆ دادەدەن و پێیـان وا دەبـێ لـە غەریبایـەتی مـردووە، کـپ و بێدەنگ دادەنیشن، لە ناکاو کـابرای درێـژ بـوو سـەر لـە بـن پەتوویەکـە دێنێتـە دەر و دەستێکی هەڵدێنێ و دەڵێ: کاکە بەخێرێن. دەو سورعەت و خێراییەدا هەر دووکیـان لە ترسان دەرکی ئامبۆلانسەکە دەکەنـەوە و خۆیـان هەڵـدەدێرنە خـوار، یـەکیان لاقـی دەشکێ و ئەویدیکەشیان جێبـەجێ خوێنـڕێژی مێشـکی دەکـا و هـەر لـە سـەر ئـەو بڕانکادرە بۆ ناشتن بردیانە سەر قەبران.

❖ وەستا عەلی دولبەرەڕەشی ژنەکـەی مـرد و بـە پـیری سـەر تـەنیا و بێکـەس دەماڵدا ماوە، ڕۆژێک لێم پرسی ئـەرێ مـام عـەلی چۆنـە ژن ناهێنییـەوە؟ کـوتی: ژنی پێشێ بۆ لای خۆت دەکێشێ، ژنی دوایە هەر بەڵایە مێردت پێدەکا بۆ ماڵی دنیایـە، دوو ڕۆژ پێ ناچێ دەتکێشێتە دادگایە، دە جا لێم گەڕێ ئەگەر وایە.

❖ دە مەجلیسێکدا کاک قـادرم کـوتی: پیـاو ئەوەنـدە هـەوڵ و تەقەللایـە بـدا و سەروەت و سامانی هەبێ کە بنیادەمە کەمزانەکان ڕێزی لێ بگرن، ئەوەندەش هەوڵ بـۆ فێربوونی عیلم و زانیـن بدا کە ئینسانە عالم و زاناکان قەدری لێبگرن و لە خۆیانی بـزانن. (بەڵام بەداخەوە ئەو دووانە هەرگیز پێکەوە جێبەجێ نابن).

❖ کچە گەورەکەی عەلی... یان بە بـووک دەبـرد، دەو کاتـەدا کـە بـووک سـوار دەکرا و دایک و کەس و کاری بووک بۆی دەگریان خوشکەچکۆلەکەی بووک سەری بـە لاشیپانەی دەرکەوە نابوو و دەیکوت: ئای خۆشکێ گیان خۆزگە بەخۆت.

❖ بەیانییەکی زوو تووشی ئەبووبەکری مەجنوون بووم کوتم: چۆنی؟ کوتی: جا چۆن بم؟ بە سەری خۆم چ ڕەپێ نێم و چ ڕەپێم نێن هەر لە دوایەم.

❖ ڕۆژانە دە کاتێکی دیاریکراودا بە خزمەت بابم دەگەیشتم. ئەو ڕۆژە وێڕا نەگەیشتم و درەنگتر چوومە لای، پرسی لە کوێ بووی؟ کوتم میوانم هەبوو. کوتی: میوانی خۆیان بوون یا میوانی خۆت بوون یا میوانی خوای بوون؟ کوتم: دە مەبەستت ناگەم. ئەو کە دەیەویست شتێکی تازەم فێر کا کوتی: ئەو ڕۆژەی کە مووسا بۆ ملاقات دەگەڵ بینایی‌چاوان ڕۆیشتە سەر کێوی توور، درەنگتر لە وەعدەی دیاریکراو گەیشتە سەر قەرار.

خوا فەرمووی: مووسا بۆ درەنگ هاتی؟

مووسا عەرزی کرد: قوربان میوانم هەبوو.

خوا فەرمووی: میوانی خۆی بوو، یا میوانی خۆت بوو، یا میوانی من بوو؟

مووسا وەک تۆ کوتی: مانای ئەو پرسیارەت نازانم.

خوا فەرمووی: کاتێ زاڵم و دەسەڵاتدارێک بە زۆرە ملی لێت وە ژوور دەکەوێ و بە کەڵەگایی میوانت دەبێ و تۆ ناتوانی هیچ بڵێی، ئەوە میوانی خۆیەتی.

کاتێ دەگەڵ کەسێک دۆستایەتی دەکەی و هاموشۆی یەکتر دەکەن و یەکترتان خۆش دەوێ ئەوە میوانی خۆتە.

بەڵام کاتێ کەسێکی نەدیو و نەناس و بێ جێ و ڕێ یا ڕێبوارێک دێت و لە ڕووی ناچاری خۆیەوە میوانت دەبێ ئەوە میوانی منە.

❖ دوکتور عەوڵا مەولەوی بۆ قسەخۆشی بەنێوبانگە و زۆربەی قسەکانیم کۆ کردووەتەوە، مراد خەڵکی قۆزلوێ بوو، زۆر درێژ و باڵابەرز بوو، ڕۆژێک هاتە لای دوکتور

مەولەوی و کوتی: قوربان بەردموام سەرم دە گێژەوە دێ، دوکتور سەرتاپێ چاوێکی لێکرد و کوتی: شتێکی سەیر نییە، چونکی ئەگەر منیش لە جێی سەرت لەو عاسمانەی بایەم دە گێژەوە دەهاتم.

❖ دەو چەند ساڵەی ڕابردوودا چینی کارمەند و بەتایبەت مامۆستایانی قوتابخانە هەرکام بە جۆرێک گلەیی خۆیان لە کەمی معاش دەربڕیوە. کاک سمایلی فتووحی یەکێک لەو مامۆستا قسەخۆشانەیە تەمەنی لە هەشتا تێپەڕیوە و هەموو ددانەکانی ساغن، پار تووشی هاتم و کوتم: پێم سەیرە ددانەکانت ئاوا ساغ ماون! دە وڵامدا کوتی: پێ سەیر بوونی ناوێ، شت کاری پێنەکەی لە خۆڕا بۆ خرا دەبێ؟

❖ لە بێژوێ شێخ ڕەئووف نەخشبەندی دەگەڵ سێ کەسان بوو، وەختی نیوەڕۆ دەسنوێژیان هەڵگرت و دوویان دەگەڵ شێخ ڕەئووف نوێژیان دابەست بەڵام یەکیان نوێژی نەکرد، کاتێ سڵاوی نوێژیان داوە ئەوەی نوێژی نەکردبوو کوتی: نوێژەکەتان سەهووی تێدا بوو لە جیاتی چوارڕەکعەتان سێ ڕەکعەتتان کرد، شێخ ئاوڕی لە یەکێک لە هاوڕێیان داوە پرسی تۆ بەو سەهویەت زانی؟ کوتی: قوربان ڕاستییەکەی دە کاتی نوێژکردندا لێرە نەبووم لە هەولێرێ بووم، نوێژکەرەکەی دی کوتی: هەی درۆزن! بۆ تووشت نەبووم؟ دەنا بە سەری شێخ ئەمنیش لەوێ بووم.

❖ خەڵکی قەدیم زۆر دڵپاک و ساویلکە بوون. خالاغایەک بوو بە دێیاندا دەگەڕا و کەتیرەی دەکڕی. ئەگەر دە ئاواییەکدا دوو کیلۆیی بۆ کێشانی کەتیرە نەبایە دەیکوت: خەمی ناوێ لاقی من حۆقەیە و قورساییەکەی سێیەکە (دووکیلۆ)یە، بەو جورە لایەکی تەرازوو کەتیرەی تێدەکرد و لاقی خۆشی لەسەر لایەکەی دیکە دادەنا،

هەرکات تەماحی پڕ دەبوو سەبر لاقەکەی هەڵدێنا و دەیکوت تەواوە.

❖ کابرایەک دوو کچی بوو وەختی بەشـوودانیان یـەکیانی دا بـە کـوڕی شـێخ و ئەوی دیکەیانی دا بە کوڕی ئاغا، بە دایم کەیفی ساز بـوو و فیکـەی سمـێلانی دەهـات. کە لێیان پرسی چۆنە کەیفت ئاوا سـازە؟ کـوتی: بـە بەشـوودانی ئـەو دوو کچـە دنیـا و قیامەتم کڕیوە، زاوایەکم هەیە کوڕە ئاغایە و ئاگای لە دنیامـە، زاوایەکیشـم هـەیـە کـوڕە شێخە و ئاگای لە قیامەتمە، زۆری پێنەچوو هەر دوو کچـی تـەلاق دران لـە ناڕەحتیـان وەک لۆتی مەیموون لێ مـردوو خـەمبار لـووتی داژەنی، کـە لێیـان دەپرسـی بـۆ وای؟ دەیکوت: هەم دنیام چوو هەم قیامەتم.

❖ کاک عەلا سپێهرەدین لە پیاوباشەکانی بنەماڵەی شـێخی بورهانـە و خـاوەنی ڕەوشتی تایبەتە، لـە خۆبـوردو و دلاوایـە، شـەوی ٧٧/٨/٧ میـوانی بـووم، باسـی نـوور و تیشک و شەبەق و ئەو جۆرە شتانەمان دەکرد کوتی: حەمە دممینی مامـەقازی کلاسـی پێنجومی سەرەتایی بوو و دەرسی ڕیازی باش نەدەزانی، من لە خانـەقا گیرسـابوومەوە و شەوانە دە فێربـوونی ئـەو دەرسـەدا یارمـەتیم دەدا. شـەوێک لـە ڕاسـت مەسـەلەیەک ڕاهاتین: نوور دە هەر سانییەیەکدا ٣٠٠٠٠٠ کیلۆمیتر ڕێ دەبـڕێ دە شـەش دەقیقانـدا چەند ڕێ دەبڕێ؟

هەرچی هەوڵم دا بۆم حاڵی نەبوو، ئاخری تووڕە بووم و کـوتم: ئەسلـەن دەزانی نـوور چییە؟ زۆر بە ئارامی کوتی: بۆ نازانم؟ نوور ئەوەیە کە لە مەرقەدی شێخان هەڵدەستێ.

❖ لـە دلـپاکێکیان پرسـی: موسلـمان کـێن و موسلـمانییەتی چییـە؟ کـوتی: موسڵمان دە ژێر خاکـدان و موسوڵمانییەتی دە کتێبەکاندایە.

❖ کابرایەک ئەسپێکی هێنابوو بازاڕ، مشتەری ئەگەر لە پێشەوە ڕا بۆی دەچوو، ئەسپەکە یا هەڵدەستا سەر پاشوان یا قەپی لە مشتەریەکە دەگرت، ئەگەر لە پشتەوەڕا بۆی چووبا وە بەر لووشک و جووتانی دەدا. پێیان کوت: ئەم ئەسپە بە کاری کەس نایە و کەسیش نایەوێ، لەخۆڕا بۆ هێناوتە بازاڕ؟ کابرا کوتی: دە ڕەحمەت لە بابتان، لەبەر ئەوەم هێناوە تا ئێوە بزانن کە من چۆن بە دەستییەوە پێوە بووم و چی لە دەستی دەکێشم و بۆخۆشی لە زمانی ئێوە ببیسێ کە لە من کەرتری وە گیر ناکەوێ هەتا بیکڕێ و ڕایگرێ، بەڵکوو حەیا بیگرێ و چابێ.

❖ خەڵکی مەهاباد پاشگرێکی «ێ» دەخەنە دوای هێندێک لە وشەکان بۆ نموونە وەختایەک لێیان دەپرسی خەڵکی کوێی؟ لە جیاتی ئەوەی بڵێن مەهاباد، ئەڵێن مەهابادێ؛ دۆستان بۆجەفەنگ و تەرکی ئەم عادەتە ئەو نەقڵەیان بۆ ساز کردوون: ماڵێکی بۆکانی هاتنە مەهاباد، پشیلەکەشیان دەگەڵ خویان هێنا، پاشی دوو ساڵ چوونەوە بۆکان و پشیلەکەیان دەگەڵ خویان بردەوە، پشیلەکە دە پێشدا بەر لەو دووساڵە لە بۆکان دەیمیاواند دەیکوت: میاو میاو، بەڵام ئەو جار دوای گەڕانەوە بۆ بۆکان، دەیکوت: میاوێ میاوێ.

❖ کاک عەلی مرادی گێڕایەوە: دەگەڵ عابیدی قەنداقچی و سەیدحەسەنی کابانێ چووبووینە باغەکانی ئیندرقاش، باغەوان هات و کوتی: ئەوە لە چی دەگەڕێن؟ کوتم: جومعەیە و هاتووین ئیسراحەتێکی بکەین و بحەسێینەوە.

عابید کوتی: کاکی باغەوان ئەو خەڵکە زۆر سەیرن لە شتێکی دەگەڕێن کە هێشتا خودا دروستی نەکردووە.

باغەوان کوتی: چۆن؟

عابید کوتی: ئەی چۆنی ناوێ، ئەو خەڵکەی دەیبینی شەو و ڕۆژ شـانوپیل دەکـوتن، هەوڵـێ دەدەن هـەتا بحەسـێنەوە کـە چـی حەسـانەوەیـەک نییـە هـەتا بیگـەنێ و بحەسێنەوە.

❖ کابرایەک لە دەست قەرزدارێک ڕۆیشتە دادگا و شکایەتی کرد. کاتـێ کـابرای قەرزداریان حازر کرد خاوەنی قەرز کوتی: ئەوەندە و ئەوەندە و ئەوەندەم پێ قەرزدارە.

قازی ڕووی دە قەرزدار کرد و کوتی: دەڵێی چی؟

قەرزدار کوتی: قوربان ئـەو کابرایـە ڕاسـت دەکـا، کـەمی کوتـووە و زۆری نـەکوتووە، لەوەی دەیڵێ زور زیاتری پێ قەرزدارم.

قازی کوتی: دەی کەوا دەزانی بۆ نایدەیەوە؟

قەرزدار کوتی: قوربان باوەڕ بفەرموو پووڵی نەغدم نییە، بەڵام بێ، مـەڕ دەڵـێ، وشـتر دەڵێ، گاوگۆل دەڵێ، هەرچی پێی خۆشە دەیدەمێ.

خاوەنقەرز هاواری لێ هەستا: کوڕە قوربان قازی درۆیان دەکا، ئەوە عەشـیای خـوای دەماڵێدا نییە و کێچان دە گیرفانیدا سەوزەڵەی دەڵێن و هەشتی دە گرێوی نۆیدایە.

قـازی کـوتی: دە پیـاوی ناحیسـابی ئەگـەر ئەوانـە دەزانی شـکایەت و داوای چـی لێدەکەی؟

❖ سالان ئەگـەر جحێلـێک شـەنگ و شـۆخ بایـە دەیـانکوت: دەڵـێی جحێلـی یالاوەیە. کەوتمە تاقیباتی ئەو قسەیە تـا بـزانم سـەرچاوەکەی چییـە؟ ڕۆژی ۷۹/۱۰/۲٥ تووشی کاک عەولای شەرەفکەندی بووم و دەو بارەیەدا پرسـیارم لێکـردە کـوتی: سـالان پێشتر دەیانکوت دەڵێی جحێلی یالاوەیە هێلکـەی دە باغەڵـیدا دەکوڵـێ، مـەبەسـتیان لەوە بوو جحێلی یالاوە گەرم و گوڕ و لە عیشقن. سالان لە یـالاوەی جحـێلان لـە سـەر

بان و سەر ڕێی کانیـان ڕادەوەسـتان و دەسـتیان دە بـەر پشـتێندوکەلەکەی دەنـا، دە حالێکدا هێندە سەرما بوو ئەگەر تفـت هەلاویشـتبا دەیبەسـت، ڕادەوەسـتان، ئـەوە دە زەمانێکدا بوو کە ئەوپەڕی جل‌وبەرگی خەلک ڕانکوچۆغەیەکی تەنک بـوو، جـاری وابـوو گوییان سەرما دەیبرد، بەلام چونکی نێوبانگی خۆیـان بیسـتبۆوە حـازر نـەبوون بچنـەوە ژوور.

❖ دایکم سەیدزادە هاجەر شوکری لـە زمـانی بـابێوە زۆر جـار ئـەو قسانەی بـۆ دووپات دەکردینەوە:

سەروەت و قودرەت پێکەوەن و زانایی و پارێزگاری پێکەوە؛ ئەو دووانە قـەت دەگـەل دوانەکەی‌تر ناحاوێنەوە.

دەولەمەندی سەخی و دلاوا، یەکجار کەمن؛ چونکی ئەگـەر سـەخی بـان دەولـەمەند نەدەبوون.

دە ڕۆژی حەولەوەلایەدا فەقیر گیانی خۆی بـەخت دەکـا و دەولـەمەند پـارە، فـەقیر ناوی دەکوژێتەوە و دەولەمەند لە سەر زار و زمان دەمێنێتەوە.

سەری زل و زمانی درێژ نیشانەی زانایی نییە.

ئەگەر دوو گوێ و زمانێکت هەیە ماناکەی ئەوەیە کـە دەبـێ دووان ببیسـی و یـەکی بلێی.

بەلام بابم کە چەرمەسەری سالی گرانێی دیبوو دەیکوت: ئینسان بە گـولله بکـوژرێ زۆر خۆشترە لەوەی لە برسان بمرێ.

❖ ئەگەر کوڕێ چاک بی ڕۆژی هەینی دەتبەمە پارک، جا لە بابی خـۆت کـەوێ بە کەیفی خۆت چاو لە مندالان بکە چۆن بەستەنی دەخۆن.

❖ باشە چووبوویە دزی بۆچی ئەو منداڵانەت دەگەڵ خۆت بردبوون؟ قوربان بۆ ئەوەی فێر بن.

❖ قەدیمی کوتوویانە: بارەبەرت یەستریکی تۆری جاش بێ، ڕێگاکەت هەورازێکی تیش و تاش بێ، بارەکەت لایەک خوری و لایەک بەرداش بێ، باشترە لەوەی ناحاڵییەکت یۆڵداش بێ.

❖ مەحموودی پەرێ گێڕایەوە: کابرایەک لە بایندەرێ ڕا دەتێری کەرەکەیدا توونگە دۆی دێنا شار و دیفرۆشت، کوڕەکەم بانگ کرد و کوتم: بڕۆ سەرێک دە کووچەی نێ بزانە ئەو کابرایە دۆی پێماوە؟ کوڕەکەم چوو دەر و هاتەوە و کوتی: ئا بابە گیرفانی کەرەکەی دوو تونگەی تێدا ماوە. (گیرفانی کەرەکە مەبەستی لە تێرەکەی بوو).

❖ خەبەریان دا بە کوردە کوتیان: دوێ شەو مانگ گیرا. وتی ئەمزانی ئەگیرێ، کوتیان چۆن؟ کوتی: چۆنی ناوێ، گشت شەوێ لەمبەرەوە بۆ ئەمبەر، لەم کێفەوە بۆ ئەم کێف، چت لە جێگەی خۆی دانەمەرزێ چەی پێدێ؟ ئاخری ئەگیرێ.

❖ کابرایەک بۆ کارداری ڕۆیشتە دێیەک، پایز هاتەوە، ژن و منداڵی بەرەو پیری چوون و پرسیان: چەندت وە گیر کەوت؟ کوتی: نیوەیان نەدامێ و نیوەشم پێ بەخشین.

❖ یەکێکی حەمبەلی ڕۆیشتە دووکانی بەقاڵێک و کوتی: ئەرێ سابوونت هەیە؟

کوتی: بەڵێ، کوتی: جا ئەگەر زەحمەت نابێ دەستت جوان بشۆ دوایە بایی دووسەتمەنم پەنیر دەیە.

❖ حاجی بەشیر لە بەر شێرەی ئاوی مزگەوت دەسنوێژی هەڵدەگرت دز هات و لێنگەکەوشێکی برد، ئەو کە دە حالی قاچشوشتندا بوو ویستی ئەو قاچی دانێ و قاچەکەی دی بشوا دیتی ئەو لینگ کەوشی نەماوە، بە لارەملی ڕۆیشتە لای کەوشدروو بەڵکوو لینگی دزراوی بۆ ساز کاتەوە، کەوشدروو زۆری شێروڕێوی بۆ هێناوە: درووونی تاکەپێڵاو شوومی خراپە و دەترسم ژنەکەم بمرێ و دوایە ژنم بۆ نایەتەوە، بەڵام حاجی زۆر پاڕاوە و کەوشدروو قبووڵی کرد کە دوای دوو ڕۆژیتر کەوشەکەی بۆ حازر کا و ئەو دەتوانێ بچێ و کەوشەکەی بباتەوە. حاجی ڕۆیشت و دوای دوو ڕۆژان گەڕاوە لای کەوشدروو و داوای کەوشەکانی کردەوە، کەوشدروو پێکەنی و کوتی: حاجی گاڵتەم پێمەکە چونکی ئەو ڕۆژە دوای تۆ جحێڵێک هات لینگەکەوشەکەیتری پێبوو کوتی: حاجی ناردوومی عەرزی دەکردی کەوشەکەم دیتۆتەوە، ئەوەتامنیش لینگەکەوشەکە و ئەو پارەیەی بە جێتهێشتبوو بە کوڕە جحێڵەکەدا بۆم ناردێوە.

❖ کوڕ: باوکە ئەمشەو دەخەونمدا تۆ دووهەزار تمەنت پوول پێدابووم. باوک: ئای ڕۆڵەگیان قەدر باوک خۆت بزانە، شوکور بۆ ئەم خوایە ماوەیەکە کوڕ خاسەی هەر بۆیە گەرەکمە ئەم پوولەیەت لێ نەستێنمەوە. بڕۆ پێم مەدەوە و بە کەیف خۆت خەرجی کە.

❖ ژنێکی تەنبەڵی تەوەزەل لە سەر پیسکێری و کارنەکەری لێکدالێکدا دەگەڵ مێردەکەی شەڕیان دەکەوتە بەین. ئەو نۆرەی کە زیزبوو و تۆرا و ڕۆیشتەوە ماڵی بابی،

دایکی لێی پرسی شەڕی ئەو نۆرەتان لە سەر چی بوو؟ ژنە کوتی: دایە گیان هەموو جاران ئەگەر خەتام بووبێ ئەو نۆرەی بێخەتام، ئەو مێردە بۆ من نابێ بە مێرد، بیانووی ئەو نۆرەی شتێکی شێتانە و ڕوون و ئاشکرایە؛ دوێنێ ماسی هێناوەتەوە بەزمی پێگرتووم کە بەر لە لێنان بیانشۆمەوە، هەرچی دەڵێم پیاوەکە ئەو ماسییە بۆخۆی عومرێک دە ئاودا بووە و شۆشتنەوەی ناوێ نایسەلمێنێ و حاڵی نابێ.

❖ لەمێژ بوو میوانێک لە ماڵێک ببوو بە چلومل و نە دەڕۆیی، خانەخوێ لە چنگانی جاڕز بوو و نەیدەزانی چۆنی جواب کا، ئاخری ڕۆژێک کوتی: ئەرێ کاکە تۆ لەمێژە لە ماڵێ ڕا هاتووی بڵێی منداڵەکانت وەڕەزیت نەکەن و نیگەرانت نەبن؟ میوان ئاخێکی هەڵکێشا و کوتی: ئەزقەزا منیش هەر دەو فکرەدا بووم بۆیە دوێنێ وڵامم لێ ناردن دەرگای ماڵ داخەن و ئەوانیش بێنە ئێرە.

❖ لە زانایەکیان پرسی بۆچی قەدری معەلیم و مامۆستاکەت لە بابت زیاتر دەگری و ڕێزی زیاتری بۆ دادەنێی؟ کوتی: بابم منی لە دنیای مەلەکووتڕا هێناوەتە سەر عەرز، بەڵام مامۆستام من لە عەرزەوە دەباتەوە بۆ عالەمی مەلەکووت. (خۆزگەم بەو جۆرە مامۆستایانە)

❖ نابەڵەدێک ڕێی دە ئاوەدانییەک کەوت لە ڕادە بەدەر بەخێریان هێنا و زیادە لە ئەندازە حورمەتیان گرت، میوان ئەو دێیەی زۆر وە بەر دڵ کەوت. لە خانەخوێی پرسی: تا ئێستا پیاوی گەورە لەو دێیە لە دایک بووە؟ خانەخوێ بە سەرسووڕماوی کوتی: نەخێر، ژنی ئەو دێیە تا ئێستا کە زاون هەر منداڵیان بووە، پاشان گەورە بوون و بوونە پیاو.

❖ کووتاڵفرۆشێکی چنۆک و قرنیس قاپێکی هەنگوین کڕی و ڕووی دە بەر دەستەکەی کە تازە چەند ڕۆژ بوو ڕایگرتبوو کرد و کوتی: وشیار بە ئەوە سەم و ژەهری هەلاهیلە، هەرکەس دمی لێدا دەسبەجێ دەمرێ، پاشان بۆخۆی وە دوای کارێک کەوت و دووکان و قاپەهەنگوینی بەجێهێشت، بەردەستەکە تۆپە پارچەیەکی دەست دایە و بە قیمەتێکی زۆر کەم فرۆشتی و دای بە نان و گەڕاوە قاپەهەنگوینەکەی لە پێش خۆی دانا و هەتا پارووی ئاخر هەمووی خوارد و مڕ بۆی کەوت، کاتێ بەزاز هاتەوە دیتی بەردەستەکەی یەکتەختە بۆی کەوتووە و جوولەی ناکا، پرسی: ئەوە چ دەکەی؟ بۆ وات بە سەر هاتووە؟

کوتی: قوربان خافڵابووم و نازانم بە کوێدا دز هات و تۆپێک پارچەی دزی، منیش لە ناڕەحەتییان و لەوەی خەجالەتی تۆ دەبم دانیشتم ئەو قاپە ژەهرەی هێنابووت هەتا دڵۆپی ئاخر هەموویم بە سەرمەوە نا و خواردم و قرتەم لێبڕی؛ ئێستا لەو وەختەوە چاوەڕوانی مردنێم نازانم بۆچی نامرم!

❖ دزێک بەرماڵێکی دزی و دای بە کوڕەکەی بیباتە بازاڕ و بیفرۆشێ، ئەسقەزا دزێکی دیکە بەرماڵەکەی لە کوڕەکە دزیوە، ئێوارێ دەسبەتاڵ گەڕاوە ماڵ. بابی پرسی: بە چەندیت فرۆشت؟ کوتی: بازاڕ کەساد بوو هیچ قازانجی نەکرد بە مایەی خۆی فرۆشتمەوە.

❖ دە زەمانی ئەنەوشێرەواندا دزێک پەیدا ببوو هەرچی هەوڵیان دەدا بۆیان نەدەدیتراوە، ڕۆژێک ئەنەوشێرەوان و بوزورگمێهر و ژومارەیەک لە دەستووپێوەندان لە ڕاو و شکار دەگەڕانەوە تووشی پیاوێک بوون بەڕێدا دەڕۆیشت و هەروا لە بەرە خۆیەوە قسەی دەکرد و ورتەی دەهات، ئەنەوشێرەوان پرسی ئەوە کێیە؟ کوتیان: قوربان ئەوە

شاعیره. کوتی: دەڵێ چی؟ کوتیان قوربان ده عالەمی خۆیدایه و شێعران دەڵێ. کوتی: باشه ئێستا دەڵێ چی؟ کوتیان قوربان دەڵێ: نه ئاشقم نه بێمارم شەو هەتا سەحەر بێدارم. ئەنەوشێرەوان کوتی: بیگرن، مادام ئاشق نەبێ و بێمار و نەخۆش نەبێ و شەو هەتا سەحەر بێدار و بەخەبەر بێ، هیچ گومانتان نەبێ ئەوە دزەکەیە.

❖ کابرایەک نوێژی دەکرد، دوو کەس بە پەنایدا ڕابردن یەکیان ئاخێکی هەڵکێشا و کوتی: خۆزگەم بە خوی کا، وەک ئێمە ئەسیری فێڵ و تەماحی دنیا نییە و خەریکی نوێژ و عیبادەت بۆ خوای خۆیەتی، کابرای نوێژکەر بەو تاریفاتە فڕی سوار بوو ده حاڵێکدا خەریکی نوێژکردن بوو کوتی: بەڕۆژووشم.

❖ دەوڵەمەندیکی لەچەر ئەنگوستیلەیەکی بێنەقیمەی دا بە عابیدێک و کوتی دوعایەکم بۆ بکە، عابید لە ئەنگوستیلەکەی ڕوانی و سەر و دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و کوتی: یاڕەبی خوا لە بەهەشت قەسریکی بێمیچ و بانت بە نسیب کا.

❖ قازی: ئەو سێ کەسە ئاگایان لێبووە کە تۆ دزیت کردووە، بڵێ بزانم وڵامت چییە؟

جا قوربان ئەوە نەبوو بە قسە، ئەو سێ کەسە ئاگایان لێبووە من دزیم کردووە ئیزنم بدە دەچمە دەر حەزدەکەی هەزار کەسان دێنم کە ئاگایان لێنەبووە کە من دزیم کردووە.

❖ چوارکەس لە مەجلیسێک دانیشتبووین، یەکیان پاکەتی سیغاری هێنا دەر و کوتی: فەرموو کاک ئەحمەد سیغار، کاک ئەحمەد کوتی: سپاس. ئینجا فەرمووی

نەفەری دووهەمی کرد و کوتی: کاک عەلی سیغار، کاک عەلیش کوتی: سپاس. ئینجا سیغارێکی بۆخۆی ئاور دا و ملی نا لە کێشان، لێیان پرسی ئەی بۆ فەرمووی کاک ڕەسووڵت نەکرد؟ کوتی: ئاخر کاک ڕەسووڵ سیغارکێشە، ئەگەر فەرمووم کردبا دەیکێشا.

❖ لە کتێبفرۆشێکیان پرسی: ئەوساڵ وەزعی کار و کاسبیت چۆنە؟ کوتی: خراپ. پرسیان: بۆ؟ کوتی: دەو دەور و زەمانەیەدا ئەوانەی خوێندەواری و تێگەیشتنیان هەیە و قەدری کتێب دەزانن لە بەر سەختی گوزەران پووڵی کڕینی کتێبیان نییە، ئەوانەی پووڵیشیان هەیە قەدری تێگەیشتن و کتێبی نازانن و نایکڕن؛ کەوابێ کار و کاسبی من دەو پەڕی خراپی خۆیدایە.

❖ دە یەکێک لە کۆبوونەوەکاندا کە بۆ مەبەستێک نوێنەر هەڵدەبژێردرا یەکێک لەو کەسانەی کە خۆی بۆ هەڵبژاردن نێونووس کردبوو لە پشت میکرۆفۆن قسەی دەکرد و دەیکوت: هەرچی بەدبەختی هەتا ئێستا بە سەرمان هاتووە هەمووی لەو ئیسمانەڕابووە: فاشیسم، ڕادیکالیسم، ئیمپریالیسم... هەموو ئەوانە بوونە خۆرەی کۆمەڵگای ئێمە. پیرەپیاوێک، لە پشتەوەڕا هەڵیدایە: هەی بە بابەوەت دەسەر گەڕێم قسەی حیسابی بەوەی دەڵێن هەموویانت کوت باسی ئەو ڕۆماتیسمەی منت نەکرد ئەوە دە ساڵی عەلەنتەواوە ئاراو و قاراوی لێ هەڵگرتووم.

❖ دە سەفەرێکدا کە شێخ ڕەزای تاڵەبانی دەچێتە لای ناسرەددین شای قاجار، وەختی خواحافیزی ئیحتیرامی شاهانە بە جێ دێنێ و بە ڕەسمی ئەو زەمانی یەکقەد لە بەرامبەر شادا دادێتەوە، بەو کارە مێزەری لە سەر دەکەوێ و حازریانی مەجلیس

هەموو بە شێخ ڕەزا پێدەکەنن و بە قەولی خۆیان گاڵتەی پێدەکەن، بەڵام شێخ ڕەزا بێ ئەوەی تێکچێ یا خۆی بدۆڕێنێ، دەڵێ:

| | |
|---|---|
| رسم فرنگیان کلـه از سـر گـرفتن اسـت | تعظـیم چـون کننـد خداونـد جـاه را |
| من اکتفا بـه شـیوەی ایشـان نمـی‌کـنم | هم سر بـه پایـت افکـنم و هـم کـلاه را |

❖ ڕۆژی ٧٥/١٠/١٩ بە ماشێن لە هەورازی دۆڵەتوێ وە سەر دەکەوتین، ڕێگا زۆر بە ترس بوو، یەکێک کوتی: ئایەتەلکورسییەکی بخوێنن با تووشی بەڵایەکی نەبین. ڕەسوو مەمۆ بەو جۆرەی دۆعای خۆی خوێندەوە:

قول‌هوئەڵلاهوو هەزار، سەت‌هەزار و بیست و چوار، دەوری خۆم کرد بە حەسار، حەساری ملکی جەببار، دەوری لائیلاهە ئیللەڵلا بێ، هاچەری قول‌هوئەڵلابێ، بە دەستی ڕەسوولەڵلا بێ.

❖ کاک عەزیز مەعرووفی لە هەمزاوا گێڕایەوە: لە مەزرا لە ڕاست کیسەڵێکڕا هاتم، غارغارێنی دەکرد دەڕۆیشتە دم ئاو دەستی دەکرد بە ئاو خواردنەوە پاشان دەهاتە دەر پنجەمێکوکێک لەوێ بوو قەپی پێدا دەگرت و سەرلەنوێ ئەو کارەی دوو پات دەکردەوە. کاری کیسەڵەکە ئاسایی نەبوو هەر بۆیە مێکوکەکەم لە بەر دمی هەڵقەند و لامبرد تا بزانم ئەو جار چ دەکا؟ کاتێ کیسەڵ لە ئاو خواردنەوەی بۆوە هاتە دەر و لە مێکوکەکە گەڕا نەیدیتەوە، لە ناکاو لە حاستە خۆی وەک بۆمب تەقی و پرش و بڵاو بوو، تەنانەت قاپێلکەکەشی بوو بە چەند لەت، شتەکەم زۆر پێ سەیر بوو؛ بە نووکە دارێک دە گۆشتەکەیم وەردا بزانم چ شتێک بووە بە هۆی ئەو تەقینە، چاوم بە توێژە مارێک کەوت وا دیار بوو کیسەڵ توێژمارەکەی خواردبوو و بەوی وای لێهاتبوو. (مێکوک جۆرێک

گیای کوێستانییە و دەرمانی مەعدەیە ـ توێژەمار: ئەو پێستەیە کە مار ساڵانە جارێک بە هۆی گەورە بوون لە خۆی جیای دەکاتەوە).

❖ کوڕی لوقمانی حەکیم دەگەڵ کوڕی کابرایەک شەڕیان کەوتە بەین، کوڕی لوقمان هەڕەشەی لە کوڕەکەی دیکە کرد و کوتی: هیچ دەزانی من کوڕی لوقمانی حەکیمم، ڕاوەستە بابت نەخۆش بێ بە بابم دەڵێم چاکی نەکاتەوە، کوڕەکە کوتی: بە هەویابە! بابی من نەخۆش نابێ و پێویستی بە بابی تۆ نابێ چونکی بابی من دەزانێ ڕۆژێ جارێک، حەوتەی جارێک، مانگێ جارێک، ساڵێ جارێک.

کوڕی لوقمان ئەو قسەی پێ سەیر بوو کە ڕۆیشتەوە بۆ بابی گێڕاوە، لوقمان چوو دە فکرەوە و پاشان کوتی: ڕاستی کوتووە ئەگەر بابی ئەو کوڕە وەک کوڕەکەی کوتوویەتی وا بێ هەرگیز پێویستی بە من نابێ، کوڕی لوقمان کوتی: باشترم حاڵی کە، لوقمان کوتی: بابی ئەو کوڕە دە شەو و ڕۆژدا تاقە ژەمێک تێر بە زگی دەخوا زگپەرەست و نەوسن نییە و بە سەر ئیشتیای خۆیدا زاڵە، بە لانی کەمەوە حەوتەی جارێک خۆی و لیباسی بەری دەشوا، مانگێ جارێک دەگەڵ خێزانی تێکەڵاوی دەکا و داوێنپیس و هەوسباز نییە، دە ساڵیشدا جارێک خوێن دەدا، کەوا بێ گومان ناکەم هەرگیز بابی ئەو کوڕە کاری بکەوێتە لای من.

❖ خالید دڵجەوان ڕۆحی شاد گێڕایەوە: کابرایەک تووشی حافزێک هات و پاش چاکوخۆشی کوتی: ئەرێ پار دزیت لێکرا دزەکەت دیتەوە؟ حافز توند دەستی کابرای گرت و کوتی: دزی من تۆی، چونکی تا ئێستا بێدەنگەم لێکردووە و لای کەس نەمکوتووە کە دزیم لێکراوە، تەنیا من و دزەکە و خوا لەو باسە ئاگادارین.

❖ مەلا عەبدوڵلا فازلی بە ڕەحمەتی خوا شاد بێ لە یەکەمین معەللیمانی مەهاباد بوو گێڕایەوە: معاشم نزیک چوار تمەن بوو کە دە ساڵدا مانگێک وەرمان نەدەگرت و دەبوو بە یارمەتی بۆ دەوڵەت و بە کورتی نەیاندەداینێ، نزیک بە دوو مانگ بوو لە ماڵی ئێمە خۆراکی گەرم وەسەر ئاور نەنرا بوو تەنیا پەنیر و ماستمان دەخوارد ئەویش ئەگەر بووبایە.

ڕۆژێک چوارکەسم لێ وە ژوور کەوتن و کوتیان: مەلا عەولا خەزێنەت بۆ وە دەرکەوتووە، فکری وەم کرد وەختی خوی لە گڵۆلان ژیاوین لەوانەیە لەوێ خەزێنەیەک دیترابێتەوە و بەشی منیشی تێکەوتبێ. کوتم نانیان بۆهێنان، پاشی نان‌خواردن یەکیان پرسی ئەری مۆری مەلاڕەحمانی بابت ماوە؟ کوتم: بەڵێ ماوە، کردیان بە شادی کە ئیدی ئەو جار بە ڕاستی قسەکەمان وە ڕاست گەڕا و تۆ لە فەقیری و نەداری نەجاتیت بوو.

پاشان یەکیان کوتی: ئێمە بەڵگە و ئیستیشهادییەمان بۆملکێکی زۆر لە دەور و بەری شار نووسیوە وقامکمان پێوە ناوە کە بابی ئێمە ئەو ملکانەی لە بابی خاوەنانی ئێستایان کڕیوە، تەنیا دوو سێ مۆری بابتمان دەوێ بۆمان لێدە با نیشان بدرێ کە دەو کاتیدا شاهید و ئاگاداری ئەو معاملەیە بووە، ئیدی ئێمە لە ماڵی دنیا بێ نیازت دەکەین.

بانگی خێزانم کرد و کوتم: دا ئەو کوتک و بەردەم بۆ بێنە، کاتێ هێنای مۆرەکەی بابم لە سەر بەردەکە دانا و وەبەر کوتکانم دا و لە پێش چاویان ورد وردم کرد و کوتم: بابی من عومرێک بە فەقیری و بە شەرەفەوە ژیاوە،مودەڕیسی مزگەوتی سور بووە و دەیان بلیمەت و زانا دە مەکتەبی ئەودا پێگەیون، جا چۆن بۆخاتری ئەوەی منداڵانی من پارووی گەرم و چەور بخۆن بابی خۆم تێکەڵاوی گوناه و تاوانی وا بکەم؟

❖ منداڵ بووم لە گەڕەکی هەرمەنیان جیرانێکمان بوو بەردەوام ژن و مێرد

پێکەوە شەڕیان بوو، ئەگەر شەو ئاشت بووبانەوە بۆ بەیانی لە سەررا بە شەڕ دەهاتنەوە، دەر و دراوسێ لە دەست شەڕ و ئاشتکردنەوەیان ماندوو و وە ئامان هاتبوون، شەوێک لە سەردەستی بابم ئاشت بوونەوە و بابم هەڕەشەی لێکردن کە ئەگەر ئەوجار قیرەیان لێ ساز بێتەوە هەر دووکیان وە بەر شەق دا، بەلام دوای ئەو هەڕەشە سەختەش بەیانی دەنگ و هەرایان بەرز بۆوە! بابم و چەند کەیخودای دیکە بە دەنگیانەوە دەچن تا بزانن شەڕی ئەو نۆرەیان لە سەر چییە؟ ژنە دەڵێ: شەوێ پاش ئەوەی ئاشت بووینەوە مێردەکەم کوتی: ڕەببی ئافرەت گورگی کوێر بتخوا، منیش بە پێکەنینەوە کوتم جا بۆ گورگی کوێر؟ ئەویش کوتی: هەتا نەزانێ کە چ گوویەکی خواردووە.

❖ سالی ١٣٦٤ بە هۆی کەمبوونی وزەی کارەبا خۆش‌خۆش بەرقی شار هەڵدەبڕا و دەکەوتینە تاریکی. تلەویزیۆن بەردەوام تەبلیغی دەکرد: لامپی ئیزافی خامووش، شەوێک کابرایەک کە باش نییە ناوی بێنم چەند میوانی هاتبوو، چاکی خواردبوو و باشی قسە بۆ دەهات دەیکوت: شەرع دەڵێ: ئەگەر ژنێکت هێنابێ وەک ئەوەیە لامپێکت (گڵۆپێکت) هەڵکردبێ، دووان بێنی وەک ئەوەیە دوو لامپت هەلکردبێ، بیکەیە سێ وەک ئەوەیە لۆستێرت هەلاوەسیبێ، دەو کاتەیدا ژنەکەی بە کەشەفە چاوە هاتە ژوور و کوتی: ئێستا ئەو گرمەگرم و نەڕەنەڕەت لە چییە؟ باسی چ دەکەی؟ کابرا بە ترسەوە کوتی: هیچ دەڵێم لامپی ئیزافی خامووش.

❖ کابرایەک بە کەسێک قەرزدار بوو، چەند جار داوای لێکرد بەلام نەیداوە و تەنانەت جاری ئاخر حاشای لە قەرزدار بوونی خۆی کرد، ناچار ڕۆیشتە لای قازی عەلی و شکایەتی لە کابرا کرد. قازی عەلی بە دوای کابرای قەرزداریدا نارد و پرسی: تۆ پوولی ئەو کابرایەت لەسەرە؟ کوتی: نەخێر، کوتی: حازری سوێندی بۆ بخۆی؟ کوتی: بەلێ،

کوتی: جا کە وایە بڕۆ دەسنوێژی بشۆ، کابرا چوو دەسـنوێژی هەڵـگرت و هـات لـە لای قورئانەکە چۆکی دادا و ماچی کرد و کوتی: بەو قورئانەی پووڵی ئـەو کابرایـەم لـە سـەرە بەڵام نیمە بیدەمەوە، قازی عەلی کوتی: هەستە بابم، تۆ شکایەتی چی لێدەکەی؟

❖ لە مەهابادی کۆن ڕادیۆتلـەویزیۆن نـەبوو، شـەو کـە دادەهـات و نـان و چـایی دەخورا هەر ماڵەی بە جورێک خۆیان دەخافڵاند، جۆرابێن، حەکایەتخوانی، کۆسـە سـاز کردن، میرمیرێن و زۆر شتی دیکە باو بوو. یەکێک لـەو ماڵانـە کـاک ڕەحمـانی قـازی، برایم و جەعفەر و ڕەشە و نادری کوڕی لـە خـۆی دەهاڵانـد و شـانامەی فیردەوسـی بـۆ دەخوێندنەوە، ئەو کاتی سەیدحەسەنی شیلاناوێ کارداری ماڵـی ڕەحمـانی قـازی بـوو ئەویش چەند کوڕی بوو کە دە نێویاندا تەها لە هەموویان بەتاقەتتر بوو ئـەوانیش شـەوانە گوێیان دەدا بە شانامە، شەو بە خێر و خۆشی دەگوزەرا بەڵام هەر کە ڕۆژ دادەهات تـەها هەوای پاڵەوانەکانی نێو شانامەی دەکەوتە کەللەی، ئاغا ڕەشەی ڕەحمانی قـازی وە بـن خۆی دەدا و هەتا دەیتوانی دەیکوتا، شەوێک لە شەوان کە حەکایەت گـەیشـتە شـەڕی ڕۆسـتەم و ئەفراسیاب و ڕۆژی پێشتر ئاغاڕەشـە زۆری وێکـەوتبوو دە نێـو حەکایەتەکـەدا کە زۆر بە باشی گوێیان دابوویە کوتی: ئەرێ بابە ڕوستەم لە تەهاش بەقەوەتتر بوو؟

❖ حەسەن خانی حەیدەری حەزی لە سیاسەت نەدەکرد و دە هەر مەجلیسـێکدا باسی سیاسەت کرابا، ئەو خەونوچکەی دێنا خۆی. ئەگەر باسی شتێکی دیکە کرابا تێـک ڕادەبوو و دەیکوت دەڵێن چی؟ جەماعـەتێک لـە ماڵـی شـێخ عـەولای کولیجـەی کـۆ ببوونەوە، حاجی جگە لەوەی پیاوێکی ڕەنگ پیاو و نـان بـدە و بەنێوبانگـە هۆگرییـەکی لەڕادەبەدەری بە ڕاوە تاژی هەیە، ئـەو کـات کـارلۆس ترۆریسـتی بـەنێوبانگی جیهـانی ژومارەیەک لە وەزیرانی نەفتی بە بارمتـە گرتبـوو کـە یـەکێک لـەوان ئێـرانی و نێـوی

جەمشیدی ئاموزگار بوو، دە نێو قسەکاندا یەکێک هەڵیدایە و کوتی: ئەرێ دەبێ شا خەمی جەمشیدی ئاموزگاری نەبێ؟ حەسەن خان بەو پرسیارە تێک ڕابوو و کوتی: ئێستا ئەوە دەڵێن چی؟ ئەلحان شێخ عەولا گولەزەردی لێ بدزن نارەحەت نابێ؟؟ (گولەزەرد ناوی یەکێک لە تاژییەکانی حاجی شێخ عەولا بوو).

❖ مەلا ئەحمەدی عەبباسی بۆی گێڕامەوە: فەقێ محەممەدی فەقێ خالی لە لاجان بە نێوبانگ بوو. دزێکی عەجایب بوو. دە ڕۆژگاری خۆیدا لاجانی شڵەقاندبوو. ئاخری زانا و کەیخودایانی ناوچە چوونە لای و زۆریان ئامۆژگاری کرد تاکوو فەقێ محەممەد تۆبەی کرد و وازی لە دزی هێنا. چەند ڕۆژ دواتر لە سەر بانی ماڵەکەی لە دەور و پشتی کۆڵانەی تەپەتەپ پەیدا بوو. لە ناکاو دوو کەڵەباب کە دەگژ یەکتر ڕاهاتبوون و بە شەڕ دەهاتن پێکەوە دە کۆڵانەکە دەکەون، ئەویش نەغد دەیانگرێ و دەیانکوژێتەوە و سەر بۆ ئاسمان هەڵدەبڕێ و دەڵێ: شێخ عەلاوەددین بە قوربانت بم ئەوەش خەتای منە؟

❖ سەعید خان بۆی گێڕامەوە: سابلاغییە کۆنەکان پێچەوانەی ئەورۆ دە قسەکردندا زۆر «تن» یان دەکوت، وەک دەبیتن، نابیتن و لەو بابەتانە. ڕۆژێک خالم (قازی محەممەد) کوتی: ڕۆڵە سەعید وەتی بوومە پێشەوا و ئەو نێوەی دەگەڵ خۆم ڕکێش دەکەم پەکی زۆر شتانم کەوتووە، هەموو جارێ مامڕەسووی مێرەکە ڕێ میوەم بۆ دێنێ، جارێ ترێکانی هەر قۆرەی تەواون، ناخورێن، با پچین بزانین ئەوە چ وەزعێکە؟

هەستاین بە پێیان خۆمان گەیاندە باغ، خالم دوای ماندوونەبوونی گلەیی لە مام ڕەسوو کرد: بابم ئەو میوە خراپانە چین بۆم دەنێری؟ مام ڕەسوو کوتی: جا چۆن

وادەبیتن، هەرچی چاک نەبیتن بۆت نانێریتین، ئەتۆ نابێ گلەییت لە ئێمە هەبێتن.

خالم کوتی: مام ڕەسوو ئێمەش تن، فەقیرین‌تن، پیاوە تی‌تن بکەتن لە مەو بە دواوەتن شتی چاکمان‌تن بۆ بنێرەتن، لێت مەمنوون دەبین‌تن.

❖ کابرا هاتە مردن و گیانەلایە؛ بانگی خێزانی کرد و کوتی: وەرە سەر وەسیەتم بە: ماڵەکەم دوای مردنم بەو جۆرەی پێتی دەڵێم دابەشی کە، ژنە ملی نا لە فینگەفینگێ، حەک بریا کوێر و کەڕ بایەم و ئەوەم لێ نەبیستبای.

کابرا بە ناڵەناڵ کوتی: وەختی ئەو قسانە نییە دەرفەت کەمە، چت پێدەڵێم بیکە و بڵێ بەچاوان، جا ئافرەت‌گیان دوای مردنم دووکانەکەی دەدەی بە سولەیمان.

ژن: زۆر باشە، بەڵام پیاوەکە سولەیمان گێژە و بە ساڵەوەختێک هەرچی دە دووکان‌دایە مفعی دەکاتەوە، دووکانەکەی دەدەم بە مەحموود.

پیاو: (بە ناڵەناڵ) باغەکە بدە بە برایم با ئەو سەرپەرەستێی بکا.

ژن: زۆر باشە پیاوەکە بەڵام برایم سەری لە باغ دەرناچێ ئەویش دەدەم بە قاسم.

پیاو: خانووەکەش بدە بە زێنەب.

ژن: زۆر باشە، بەڵام زێنەب پیسکێرە وێرانی دەکا، ئەویش دەدەم بە ڕابی.

پیاو: نەغدینەکەش هەرچی هەیە بیدە بە مستەفا با کاسپی پێوە بکا.

ژن: بەو چاوانەم پیاوەکە گیان ئێستا کە باوەڕت بە منە و ئەمنت کردووە بە سەر وەسیەتی خۆت، مستەفا ئەبلە خەرجە بە ساڵێک هەمووی تەخشان پەخشان دەکا و هیچی بۆ نامێنێتەوە، ئەویش دەدەم بە قادر.

پیاوەکە قەڵس دەبێ و دەڵێ: ئێستا تۆ قەرارە بمری و وەسیەتێ دەکەی یا ئەمن!!

❖ منداڵ: بابە قەرارە بچینە سنە، کەچی تۆ سەعاتێکە بە سواری ماشێن بە

دەوروبەری ماڵی خۆماندا دەخولێیەوە.

باب: ئاخر ڕۆڵەگیان دەمەوێ بزانم دایکت هیچی لە بیر نەچووە؟ دەترسم بڕۆین و لە دیواندەرە ڕێ ڕا بمانگێڕێتەوە.

❖ بابە گەورەم دەیکوت: من بابی بابی بابی بابم دیوە.

- زۆر سەیرە شتی وا چۆن دەبێ؟

- بۆ نابێ؟ بابە گەورەم لاڵ بوو دە قسەکردندا زمانی دەگیرا.

❖ ئەرێ ژنت هێناوە یا ئێستاش بۆخۆت قاپەکان دەشۆی؟ هەر دووکیان!

❖ ژن: پیاوەکە هیچ دەزانی ئەگەر شەڕی ئێران و عێراق ڕووی نەدابا و مێردەکەم نەکوژرابا ئێستا من ژنی تۆ نەدەبووم؟

مێرد: ڕاست دەکەی، بەڕاستی شەڕ بەلا و مسیبەتی زۆری بە دوا دایە.

❖ منداڵ: دایە تینوومە ئاوم دەیە.

دایک: بنوو دە نا هەڵدەستم لێت دەدەم.

منداڵ: باشە ئەگەر هەستای لێم دەی ئاوەکەشم بۆ بێنە.

❖ نەفەری ١: بە بڕوای من پیاوی بێپووڵ هیچی پێناکرێ.

نەفەری٢: نا شتێکی پێدەکرێ.

نەفەری ١: چی پێدەکرێ؟

نەفەری ٢: قەرز.

❖ بۆ ئەو کەسانەی فارسی دەزانن ئەو نەقڵە خۆشە: کتێبی فارسی دووهەمی سەرەتایی دەرسێکی تێدایە بە نێوی سەحرانەوەرد کە باسی خۆڕاگری و تاقەتی وشتر دەگەڕمادا دەکا، ڕستەیەکی تێدایە: «شتر صحرا را درنوردیده بود» یانی وشتر سەحرای پێوابوو. لە وڕە و داریانی هەورامانێ مەعلیمێکی لێبوو عەباسی نێو، ساڵەوەختێک بوو چوبو دێ و بۆ شار نەگەڕابۆوە و سەری لە ئیدارە نەدابۆوە، لە ئیدارە نیگەرانی دەبن و چەند کەس هەڵدەستن دەچن تا بزانن ماوە یا نا؟ کە دەگەنە ئاوایی دەبینن مامۆستا دڵسۆزانە خەریکی دەرس کوتنەوەیە، لێی دەپرسن بۆچی سەری شارت نەداوەتەوە؟ دەڵێ ئەو ئازووخەی دەگەڵ خۆم هێناومە هێشتا بنەی نەهاتووە، پاشان دەرس لە قوتابییان دەپرسنەوە یەکێک لە قوتابییەکان ئەو ڕستەیە بەو جۆرە دەخوێنێتەوە

«شتر ـ صحرا را ـ در ـ نور ـ دیده بود» یانێ وشتر سەحرای دەنووردا دیبوو. پاشان ڕوو دە مامۆستا دەکەن ئەویش هەر بەو جۆرەی دەخوێنێتەوە، بەرپرسی ئیدارە ڕەخنەی لێدەگرێ و دەڵێ: ئاوا نابێ ئاوا دەبێ. عەبباسی تووڕە دەبێ و دەڵێ: ماچۆ جەنابت ڕاست بێژەنی یا کتاب؟

❖ کوڕێک دە ساڵ لای دیزەکەرێک شاگرد و بەردەست بوو، ئاخری هەستی بەوە کرد کە بەتەواوی ئەو کارە فێر بووە و کاتی ئەوە هاتووە بۆخۆی دەکارەکەیدا سەربەخۆ بێ و واز لە بەردەستێتی بێنێ، ماڵاوایی لە وەستا کرد و چوو لە لایەکیدی خەریکی کار بوو، دیزە و گۆزەی زۆر باشی ساز کردن بەڵام کە ڕەنگی کردن دیتی هەرچی وەستاکەی دروستی کردبوون و ڕەنگی لێدا بوون بریقەیان دەداوە بەڵام ئەوانەی ئەو دروستی کردبوون و ڕەنگی کردبوون لێڵ و مات بوون. ناچار گەڕاوە لای وەستا و کوتی: دەبێ ئەوەشم فێر کەی. وەستا کوتی: ئەوە بە مفتە نابێ، ئەگەر دەتەوێ فێر بی دەبێ ساڵێک بەخۆڕایی لە لام کار بکەی. کوڕە قبوولی کرد و ماوەی

یازدە مانگ و بیستونۆ ڕۆژ لای وەستا کاری کرد.

ڕۆژی ئاخر وەستا بانگی کرد و لە بەر چاوی ئەو گۆزەیەکی تازە دروستکراوی لـە کـڵ هێنا دەر و دوای ساردبوونەوە سێچوار جار فووی لێکرد و ئەو تەپوتۆزەی کە لەسـەری بوو لایبرد، پاشان ڕەنگی کرد و کوتی: گۆزە دەبێ دەپێشدا فووی لێکەی تا ئـەو خـۆڵ و خاکەی پێوەیەتی لێی بێتەوە، ئەگەر وا نەکەی ڕەنگ و خوڵ تێکـەڵ دەبـن و ڕەنگەکـە بریقەی ناداتەوە، بەردەست کوتی: یانی بۆ فوویەک سالێک منـت ڕاگـیر کـرد؟ کـوتی: بەڵێ، ئەوە سنعەتە، لەمەو بەدوا قەدری ئەو فوویـە دەزانی و قـەت لـە بـیرت ناچێتـەوە، چونکی لە پێناویدا زەحمەتت کێشاوە، ئەگەر ڕۆژی یەکەم سووک و هاسان پێم کوتبـای لەوانە بوو دە گوێی نەگری و لە دە جـاران جارێـک دەکـاری نەکـەی. (شـتێک کـە بـە ئاسانی وە گیر کەوێ ئینسان قەدری نازانی)، لە قەدیمەوە کوتوویانە فەن و فوو.

❖ مەلا حەسەنی سێلوێ بەیانی چووە مزگـەوت و ڕۆیشـتە حـوجرەی فـەقێیان، یەکجار زۆر دڵخۆش بوو، فەقێکان هۆی ئەو خۆشحاڵـییەیان لـێ پرسـی، کـوتی: ئـەوڕۆ هەست دەکەم یەکێک لە ئەسحابەکانی پێغەمبەرم. کوتیان چۆن؟ کـوتی: کـە لـە مـاڵ هاتمە دەر چاوم لە هەموو لایەکی ماڵێ کرد. لە نانی ئیشکی بە دەر هیچ شـتێکمان دە ماڵدا نەبوو، لەبـەر ئـەوەی کـە ژیـانی ئەسحابەکانی پێغەمبـەرم خوێندووەتـەوە ئێسـتا هەست دەکەم یەکێک لەوانم.

❖ کاک ڕەشید شەرەفی گێڕایەوە: کابرایـەک لـە جێیـەکی ڕەقـەن و ویشـکەڕۆ قولاپی هاویشتبوو بە نیازی خۆی ماسی دەگرت، کابرایـەک زۆری چـاو لێکـرد و پاشـان هاتە لای و کوتی: براله ماسی دە چۆم و دەریادا دەگیرێ، هێنـدەی دمو بارەیـەدا بـۆی کوت تاتێی گەیاند کە بە ڕاستی بێئەقڵە.

ماسیگر قولاپەکەی خڕ کردموە و کوتی: بەڵام لە من بێئەقلتریش هەیە، چاو لـە ئـەو ڕەفیقەم کە، ئاوری کردووەتەوە و بە تەمایە من کە ماسییەکانم گرت ئەو بیانبرژێنێ.

❖ کابرایەکی شڕ و شپڕێو کە هەژاری و نەداری و بەدبەختی لـە هـەموو ڕواڵـەتی دەبـاری ڕۆیشـتە حـەمام، ئـاوگیر و فۆتـە هەڵـگر و کاربەدەسـتانی حـەمام هـیچ حەمییەتێکیان وێنەدا، بەڵام ئەو کابرایە دە کاتی چوونـەدەردا پووڵـێکی زۆر و بـەرچاوی دا بە حەمامچی و کرێکاران، ئەوانـەی کـە دە حەمامـدا ئیشـیان دەکـرد هـەموویان لـە کردموەی خۆیان بەرامبەر بەو کابرا دڵاوایە پەشیمان و نارەحەت بـوون. پاشـی دە پـازدە ڕۆژ کابرا سەر لەنوێ ڕێی دە حەمام کەوتەوە، بەڵام ئەو نـۆرەی لـە ئـاوگیر ڕابگـرە هـەتا کیسەکێش و حەمامچی هەموو وەک خولخولە بە دەوریـدا هەڵدەسـووڕان و خزمـەتیان دەکرد، بەڵام کابرا وەختی چوونە دەر لە حەمام پووڵی ئاسایی دا بە حەمامچی، یـەکێک لە کرێکاران خۆی بۆ ڕانەگیرا و کوتی: ئەوڕۆژە ئێمە هیچ قەدرێکمان نەگرتی ئەو هـەموو پووڵەت داینێ، بەڵام ئەوڕۆ ئەو هەموو ڕێزەت لێ‌گیرا تۆ پێچەوانە هیچت نەداینێ. کـابرا کوتی: پووڵی ئەوێ ڕۆژێ بۆکاری ئەوڕۆتان و پووڵی ئەوڕۆم بۆ کاری ئەوێڕۆژێتان.

❖ دۆستێکی نەخوێنـدەواری دەنـگ‌خۆشـم هەیـە، جـار و بـار داوای لێـدەکردم شێعری بۆ بڵێم و ئەویش بە ڕێنووسی تایبەتی خۆی بینووسێتەوە، ڕۆژێک کـە سـەرنجم لە سەردەست و قەڵەمی بوو چاوم بەو ڕەقەمە کەوت «١١٠١١» کـوتم دادەی ئـەوەم بـۆ بخوێنەوە: کوتی: دانە دانە خاڵ دانە دانە.

❖ کاک عەولای شەرەفکەندی گێڕایەوە: کاکەڵلاغای پاراستان دێی گۆمـانی پـێ لە هەموو دێیان خۆشتر بوو، ژنێکیش هەبوو نێوی ئامان بوو پێی لە هـەموو ژنـان جـوانتر

بوو، قسەی مەلایانیش شوێنیان لە سەر دانابوو و باوەڕی بە دین و ئیمان هەبوو، ئەگەر لێیان دەپرسی: ئەرێ دمو دنیایەدا ئاواتت چییە؟ دەیکوت: گومانت بێ و ئامانت بێ و ئیمانت بێ، ئەرێ بڵێی دمو دنیایەدا چ ئاواتی دیکە بێجگە لەوانە هەبن؟

❖ لەتیفی بەکانی شۆفیری ئوتووبووسی نێوان مەهاباد ـ ورمێ و خەلکی بۆکانە و دە حالی حازردا خۆی بە ڕەئیس و بەرپرسی حیزبی کەران دەزانێ.

لەتیف دە بانگەوازێکدا ڕایگەیاندووە: دە نێو ئەو شتانەیدا کە بۆ کێشان دەبن کەر تەنیا باری دەکێشێ، ئەگەر کەسێک سیغار دەکێشێ یا چەقۆ دەکێشێ، یا شتێک بە تەرازوو دەکێشێ، یا نازی کەسێک دەکێشێ بزانن ئەو کەسە ئەندامی حیزبی ئێمە نییە و بۆی نییە لە لایەن گرووپ و تاقمی ئێمەوە قسان بکا.

❖ وەستا عەولا ئایش بانەیی (فەرەیدوونی) لە میراوێ خەیاتە و هەرچەند نەخوێندەوارە بەڵام دە شوێنی خویدا شاعیر و قسە خۆشە، کوتی: ئەسکەندەر بە دوای دەلاکێکیدا نارد هەتا بێ و سەری بۆ بتاشێ، دە کاتی سەرتاشیندا دەلاک دیتی ئەسکەندەر دوو گرێی وەک شاخی لە سەری ڕوواوە، ئەسکەندەر ڕووی دە دەلاک کرد و کوتی: بێت و ئەو سوڕەم لە جێیەک ئاشکرا کەی دڵنیا بە دەتکوژم.

دەلاک ماوەیەک ددانی بە جەرگیدا گرت و لای کەس ئەو قسەیەی نەکرد، بەڵام وردەوردە کەوتە وەسوەسە و تووشی نەخۆشی نەفسی هات، ڕۆژ بە ڕۆژ کز و بێهێزتر دەبوو ئەو قسەیە لە سەر دڵی ببوو بە کەدەر و گرییەکی گەورە؛ ئاخری تاقەتی نەهێنا و ڕۆیشتە لای حەکیم، حەکیم دوای پشکنین و چاولێکردن و پرسیار لە نەخۆشییەکەی کوتی: تۆ قسەیەکت دەدڵدایە بێت و دە دڵی خۆتدا ڕایگری و نەیدرکێنی دەمری، تۆ دەبێ ئەو قسەیە هەرچی هەیە دە دڵی خۆتدا ڕاینەگری.

کابرا لە لای حەکیم گەڕاوە، بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر بیلێم ئەسکەندەر دەمکوژێ، ئەگەر نەیلێم دە باڵ خۆمدا پێشم هەڵدێ و دەمرم، عیلاج چییە؟ چ بکەم؟ ناچار لە چۆلگەیەک ڕۆیشتە قەراغ چۆم سەری دە ئاو نا و سێ جار هاواری کرد: ئەسکەندەر شاخی هەیە، پاشان سەری لە ئاوەکە هێنا دەر و دڵی کەوتە سوکنایی، چەند ساڵ دوایە لە خوارەوەی ئەو چۆمە قامیشەلانێکی لێبوو خەڵک لەو قامیشانەیان دەبڕی و شمشاڵ و بلوێریان ساز دەکرد، بەڵام هەرچەند جارێ تێیان دەتوراند و لێیان دەدا، شمشاڵەکان ئەو دەنگەیان لێوە دەهات: ئەسکەندەر شاخی هەیە.

❖ تەنبەڵ کوتی: سەتمەن دەدەم یەکێک لووتم بۆ پا کاتەوە. کابرایەک وە تەماح کەوت، دەسرەی وە بەر لووتی تەنبەڵ گرت و کوتی: دەی فمکە! تەنبەڵ بە بێحەوسەڵەیی کوتی: سەتمەن بدەم و فمیش بکەم؟

❖ خدرەڵڵا گێڕایەوە: وسێن چاوەش، چاوەشی گوڵاوی ئاغای سۆستانێ بوو، ژنەکەیان لێ هەڵگرت و بردیان بۆ نێو گەورەکان، کوتی: گوڵاوی ئاغا ئەمن دەچم ژنی خۆ دێنمەوە. گوڵاوی ئاغا کوتی: ئەتۆ چاوەشی منی ئابڕووم دەچێ، عەیبە چۆن شتی وا دەکەی؟ کوتی: بە سەری تۆ ژنم ناکەن دەبێ بیهێنمەوە، هەرچی گوڵاوی ئاغا کوتی: نابێ، وسێن چاوەش نەیسەلماند و خۆی ڕانەگرت و ڕۆیشتە نێو گەورەکان چەند ڕۆژان بە دۆستخوا و بە ژناندا لێی ڕاسپارد، ژنەکەی ڕازی کردەوە ڕەگەڵی کەوێتەوە، هەڵیگرت و هێنایەوە. وەختایەک لە ئالاوان وە سوێی سوێستانێ کەوت، هەرای کرد: کوڕە مام گوڵاوی ئاغا نۆکەری تۆم پێدەڵێن، خەڵک بە شەوم لێ هەڵدەگرێ ئەمن بە نوێژی نیوڕێ هەڵدەگرمەوە، لە پاش ئەو هاوارەی حەیران و زوڕنایەکی بە دوایدا هەڵداشت.

❖ لە سەر سفرە باب ڕوو دەکورەکەی دەکا: دا ڕۆڵە تینوومە لیوانێکم ئاو بۆ بێنە. کوڕی گەورە: دادەی مەحموود هەستە ئەو لیوانەی بۆ بابم پڕ کە، مەحموود: دادەی زارا ئەو لیوانەی بۆ بابم پڕ کە، زارا تا ویستی قسە بکا، دایکی زارا ڕرووی دە مێردەکەی کرد و کوتی: ئەو منداڵانەی ئێمە قەت نابنە بەشەر، هەستە بۆخۆشت بخۆوە و لیوانێکیش بۆ من تێکە.

❖ سەید زادە هاجەر دایکی کاک قاسمی ڕەفیقم گێڕایەوە: ماڵمان لە بیبی‌کەند بوو ماڵێکی لێبوو وازیان لە نوێژ و ڕۆژوو هێنابوو بەڵام ڕەمەزانان وەختی پارشێو نیوسەعات بەر لە خەڵکی ئاوایی هەڵدەستان و هەتا دەیانتوانی دەیانخوارد و پاشان لێی دەنووستنەوە، خۆم بۆ ڕانەگیرا و ڕۆژێک چووم و لێیانم پرسی ئێوە کە بە ڕۆژوو نابن بۆچی پارشێوان ئەو خەوە خۆشەی لە خۆتان حەرام دەکەن و هەڵدەستنەوە؟ ژنی ماڵەکە کوتی: ئەیەڕۆ سەیدزادە تۆ بۆچی ئەمە ئەڵێی؟ ئێمە بە ناشوکری نەبێ نە نوێژ دەکەین و نە ڕۆژوو دەگرین، دەفەرمووی پارشەوەکانیش هەڵنەستینەوە و هەر بە تەواوی خۆمان کافر کەین؟!

❖ مەلا عەلی و مەلا سولەیمان پێکەوە لە غەریبایەتی فەقێ بوون. ئەو ڕۆژە مەلا عەلی پێشنیاری بۆ هەر شتێک دا مەلا سولەیمان جیبهەی دە بەرامبەردا گرت، جەنگەی نیوەڕۆ مەلا عەلی کوتی: ئەگەر ڕەزات لەسەر بێ دەچینە ئەو چلەوکەبابییە و بۆ نەهار میوانی من بە.

مەلا سولەیمان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و کوتی: لە بەیانییەوە هەرچی کوتووتە بە قسەم نەکردووی دەترسم ئەگەر ئەوەشت بە قسە نەکەم بە حیسابێکی دانێی و دڵت لێم بێشێ، فەرموو با هەموو شتێک بە قسەی من نەبێ، ئەگەر بشەرم

ئەومت بە قسەی دەکەم.

❖ خەجی خوشکم بەڕەحمەت بێ گێڕایەوە: تازە بووک بووم لـە شـارڕا بردیانمـە دۆڵەتوێ، بایزی مێردم لە مـاڵ نـەبوو، جەنگـەی نیـوەڕۆ میـوانێکم لـێ وە ژوور کـەوت ویستم هەڵوای بۆ لێنێم بەڵام لەبـەر ئـەوەی قـەتم لێنـەنابوو نەمـدەزانی هەڵـوا خـوێی دەوێ یا نا؟ بیرم کردەوە وا باشە ئەوەی بە جورێک لە میوان بپرسم، ڕووم کـردە میـوان و کوتم: یا خوا بەخێربێ، خێر و بەرەکەتت هێنا، دە براله قسەیەکی بکە و ئاوا قڕ و قـەپ دامەنیشە، ماشاڵلا ئەوەندە بێدەنگی دەڵێی هەڵوای بێ‌خوێی!
میوان بە سەر سوورماوی کوتی: بۆ خوشکە خەج لە شار خوێی دە هەڵواش دەکەن؟!
لەو ولامەی میوانڕا زانیم کە هەڵوا خوێی ناوێ، کوتم: ناوەڵلا ئەو قسەیە هەروا مەسـەلە دەنا هەڵوا قەت خوێی لێ نـادرێ، بـەو فێڵـە بـێ‌ئـەوەی لای دەر و جیرانـان بـە خـۆدا بشکێمەوە بۆ یەکەمجار هەڵوای بێ‌خوێم بۆ میوان لێنا.

❖ کوڕێک ژنی هێنـا و بـوو بـە خـاوەن منـداڵ. زۆر لـە ژیـانی ڕازی بـوو بـەڵام پیرەبابێکی بوو دەگەڵ دیکۆری لۆکس و تازەمۆدی ماڵەکەی یەکتریان نەدەگرتـەوە. بـۆ ئەوەی لە نێو دۆست و هاوقەتارانیدا ئـەو عەیبـەی لـێ‌نـەگیرێ لـە سـووچێکی حەسـار مدبەقێکیان بوو بابی برد و لەوێی دانـا و لـە بـەر چـاوانی وە لا خسـت و پاشـی هـەموو ژەمان کە بۆ خۆیان لە خواردن دەبوونەوە لەو شێو و خواردەمەنییانـەی کـە وەک بـەرماو لە بەریان دەماوە دەکاشییەکی دەکرد و بو باوکی دەبرد. بابی کـە زۆر پـیر و لـەرز ببـوو ڕۆژێک کاشییەکەی لە دەست بەربۆوە و شـکا، کوڕەکـەی زۆری پرتانـد کـە ئاگـات لـە خۆت نییە و ئەو کاشییە گرانـەت شـکاند و ناچـارم یـەکێکی دیکـەت بـۆ بکڕمـەوە. بـە تووڕەیی هاتە ژوور و دەستی کوڕە چکۆلـەکەی گـرت و بـردی بـۆ بـازاڕ، کـوڕە چکۆلـە

ڕووی کردە بابی و کوتی: بابە ئەگەر تەمات کڕینی کاشی بۆ بابەگەورەیە ئەوەنـدەم بـە قسە بکە لە جیاتی کاشی گڵ یا چینی قاپی فافۆن و نەشکێن بکڕە، ئەگـەر ئـەوە بکـەی کاری من هاسان دەکەیەوە، قاپی فافۆن دوو قازانجی هەیە یەکەم ناشکێ و پوولـەکەمان بە خۆڕایی ناچێ، دوای ئەوە وەختایەک بابەگەورە مـرد مـن هەڵـیدەگرم هـەتا تـۆ پـیر دەبی ئەو کات بۆ تۆی شێو تێدەکەم و ناچار نابم لە سەرڕا بێمەوە بازاڕ و کاشی دیکـەت بۆ بکڕمەوە.

❖ کابرایەکی قڕنیس بە هەڵکەوت دەگەڵ کوڕەکەی هاتنە شـار و بەڕێکـەوت بـە پێش دەرکی کەبابخانەیەکـدا تێپـەڕین، کوڕەکـە مژێکـی قووڵـی لـەو بـۆن و بەرامەیـە هەڵکێشا و کوتی: بابە هیچ ئاگات لەو بۆنە خۆشەیە؟ بـاب کـوتی: جـا چـۆن ئاگـام لـێ نییە! ئەگەر هەروا کوڕی چاک بی و دە ئەمر و نەهی بابی خۆتدا بی و ئەوەندەی کە لـە شارین بـڕ و بیـانووی پـڕ و پـووچم پـێ‌نـەگری، بەڵـێنت پـێ‌دەدەم لەوسـەریش‌ڕا کـە گەڕاینەوە، بەلای ئەم بۆنە خوشەدا بتهێنمەوە.

❖ پاشی کێبڕکێیەکی گەورەی وەرزیشـی هەواڵـیان بـۆ باوکێـک بـرد کوتیـان: مزگێنیمان دەیە کوڕەکەت ڕێکۆردی شکاندووە، کاتێ بابە گـوێی لـە وشـەی شـکاندووە دەبێ تۆزێک ڕادەمێنێ و دەڵێ: دەیجا بە جحەندەم شکاندوویەتی خۆ بـە خـودای مـن قڕانێکی بۆ نابژێرم، چۆنی شکاندووە با بۆخۆی چاکی کاتەوە.

❖ نیوەشەوێک دزێک ڕۆیشتە ماڵی کابرایەکی فەقیر و دەسـکورت و ملـی نـا لـە کەلێن و کولێن پشکنینێ، خاوەن‌ماڵ وەخەبـەر هـات و کـوتی: کاکـە لـە خـۆڕا خـۆت ماندوو مەکە چونکی ئەوەی تۆ بەو تاریکەشـەوە لێـی دەگـەڕی مـن بـە ڕۆژی ڕوون دەو

ماڵەدا نایدۆزمەوە.

❖ دزێک ڕۆیشتە ماڵی کابرایەکی ترسەنۆک و مەنجەڵێکی گەورەی زنجیرداری دەسدایە، خاوەن‌ماڵ خواخوای بوو هەرچی زووتر ئەو دزە شتێک دەسداتێ و بڕوا و لە کۆڵی بێتەوە؛ بەڵام دزە هەرچی خەریک بوو مەنجەڵەکەی بۆ لە دەرکە نەدەڕۆیشتە دەر، خاوەن‌ماڵ بە ترسەوە سەری لە بن لێفە هێنا دەر و دوو سێ جار کوتی: لاجەولاج، لاجەولاج.

❖ دزێک ڕویشتە ماڵی کەسێکی هەژار و دەسکورت و هەرچی گەڕا هیچی وەگیر نەکەوت، بە ناهومێدی خەریک بوو وەدەر کەوێ، خاوەن‌ماڵ سەری لە بن لێفە دەرێنا و قاقایەکی بۆ لێدا و کوتی: بارەکەت سەنگینە! دزەش خێسەیەکی لێکرد و کوتی: ماڵەکەت ڕەنگینە.

❖ کابرایەک ڕۆیشتە لای مەلا و کوتی: ئەرێ مامۆستا وەختایەک بنیادەم بۆ غوسڵ کردن بچێتە نێو چۆمێک ڕووی دە کام لا کا غوسڵەکەی خاستر دەرئەچێ؟ مەلا کە تازە لیباسەکانی دە کاتی غوسڵ‌کردندا لێ دزرا بوو، کوتی: ڕوو دەو لایە بکا کە لیباسەکانی لێ داکەندووە.

❖ حاکمێک مرد و یەکێکی زاڵم و خراپ بوو بە جێنشینی. قسەخۆشێک لە بارەگای ئەو حاکمە تازەیە بوو. ڕۆژێک حاکمی تازە ڕووی دە کابرای قسەخۆش کرد و کوتی: ئێوە دەبێ شوکرانەبژێری ئەو خوایە بن چونکێ لە وەتا من بوومە حاکمی ئێرە ئاسەواری تاعوون دەو وڵاتەیدا نەماوە. قسەخۆش کوتی: خوا زۆر عادڵە و قەت دوو

بەلایان ویکرا و هاوکات بۆ ولاتێک نانێرێ.

❖ ڕەزا بەرزەنجی نەوەی خالەمین گێڕایەوە: بە سەر شەڕی دوو ژناندا چووم، یەکیان خۆی بادا و بە ئەدا و ئەتوارەوە کوتی: فلانی فلان‌لێکراو تۆ من دەناسی؟ ئەوی دیکە کوتی: جا بۆ ناتناسم؟ زلەخابلقەی ژنی حەمەسەلیمی.

❖ شەوی ١/١٠/٦٧ دەگەل خوالێخۆشبوو هاوار (عەلی حەسەنیانی) و مامۆستا حەقێقی لە بۆکان میوانی کاک فەتاح ئەمیری بووین، مامۆستا حەقیقی ئەو نەقڵەی گێڕایەوە:

ڕۆژێک پیاوێکی بەڕواڵەت لێقەوماو دەچێتە لای والی سنە و پاش بەجێهێنانی عەرز و ئیحترامی پێویست، مل لە پاڕانەوە دەنێ و دەڵێ: قوربان لە بنەماڵەیەکی فرە نەجیبم، بەلام چبکەم لێم قەوماوە و پەنام بۆت هێناوە، بێت و یارمەتییەکم نەکەی ئابڕوو و حەیام ئەچێ.

والی دەپرسێ: ناوت چییە؟

کابرا دەڵێ: قوروان، مەرحوومی مەبرووری مەغفووری جەننەتمەکانی باوکم لە نێو ناوگەلی شیرن‌شیرن و ڕەنگاوڕەنگ و هەڵبژاردە ناومی ناگە محەمەد ئەمینی شەککەری، والی چاوێکی لێدەکا و دەڵێ: خوا دەزانێ هەتا ئەوسەری ئەو وەتاغە دەچم و دەگەڕێمەوە بێت و ناوەکەت قوولە نەکەیەوە قڕانێکت پێنادەم.

والی هەر وەک کوتبووی تا ئەو سەری وەتاغەکە چوو و گەڕاوە و بە پڕتاو پرسی: کوڕە بڵێ بزانم ناوت چییە؟

کابرا بێ ماتڵ‌بوون شەق و توند و تیژ کوتی: مینە.

❖ کابرایەک بە پڕتاو ڕۆیشتە سەر خەرمان، هێندە بە پەلە بوو بێژینگی لە بەر پێی خۆی نەدی، پێی لە سەر لایەکی دانا، لایەکەی‌دی توند وە ئەژنۆی کەوت و زۆری ئێشاند؛ تووڕە بوو دەستی دایە و بە هەموو دەمایە خوی لە عەرزی ڕاکێشا، بێژینگ هەڵبەزێوە و وە نێو چاوانی کەوت و دە خوێنی هێنا. گومانی نەما کە بێژینگ لێی کەوتۆتە شەڕ، هاواری لێ هەستا: ئەی هاوار خزمینە بگەن بە فریام بێژینگ کوشتمی.

❖ بەڕەحمەت بێ حاجی قادر خودادادی گێڕایەوە: جحێڵ بووم بە نابەڵەدی لە کوێرەدێیەک مابوومەوە. ڕووم دە دەرکی ماڵێک کرد، لە دەرێڕا هەرام کرد: ماڵێ میوانان ڕادەگرن؟ لە ژووریڕا وڵامی دامەوە: میوان بەخێر بێتە سەر چاوی دایەپیرەی خۆی، کاتی نان‌خواردن هات بێکەس و بێدەرە هیچی ئەوتۆی نەبوو میوانداری پێبکا، کەوڵەکەی ڕاخست و کوللێرەیەکی جۆی لە پێش دانام. بە ئیشتیباوە ملم دە بەر ملی خواردنی کوللێرەکە نا، پیرێژن کوتی: چاوی دایەی حەمەدیلەی کوێرە بن، پار ئەوان مەجالان بزنێکی دوڕەمان بوو دای بە حەوت و پەنادێک، دەنا ئەگەر ئەلحان مابا دۆیەکی مزری ئازەریفم بۆ دێنای نانی خۆت پێ خواردبایە (دایە پیرە هێندە دەستەنگ و خولقخۆش بوو کوللێرەکەیم پێ لە پلاوی سەدری خۆشتر بوو).

میوان نایەوێ سفرەت ڕەنگین بێ      نانت جۆیین بێ خولقت گەنمین بێ

❖ خواناسی بەنێوبانگ بایەزید بەستامی بەرداشێکی گەورەی لە پشتی بەستبوو و بەردێکی چکۆلەی بە دەستەوە گرتبوو خۆش خۆش هەڵیداویشت و دەیگرتەوە. جەماعەت لێی کۆ بوونەوە و مانای ئەو کارەیان لێ پرسی، بایەزید کوتی: ئەو بەرداشەی کۆڵم عەیبەکانی خۆمن لە پشتم بەستوون و نایانبینم بەڵام ئەو بەردە چکۆلەیە عەیبی خەڵکە لە بەر چاومە و هەر لێی دەڵێم و دەیڵێمەوە.

❖ جوولەکەیەک ویستی موسولمان بێ، ڕۆیشتە جێیەک تا یەکەم شەرتی موسولمان بوون بە ئەنجام بگەیێنێ و شادیمانێ بێنێ، گوتی: ئەشهەد و ئەللا ئیلاهە ئیللەللا، جوولەکە ڕژانە سەری و بە پەیاغان کوشتیان، دە کاتی ناشتنندا ڕێبوارێک پرسی ئەوە کێ بوو؟ کوتیان ئەوە لە مووسا هەڵبڕا و بە محەمەد نەگەیشتوو بوو.

❖ مەلا لە مزگەوت لە بارەی پیرۆزی و هاتنی مانگی ڕەمەزان مەوعیزەی دەکرد و دەیکوت: تا وەکوو مانگی نەبینن فەڕز نییە ڕۆژووی بگرن. کوردە سوێندی خوارد ئەو مانگە سەر بۆ ئاسمان هەڵنەهێنێت و خۆی بە ئەزیەت و ئازاری ڕۆژوویان دووچار نەکات. بڕیاری خۆی تا شەوی چاردە بردە سەر و سەری بۆ ئاسمان هەڵنەهێنا. شەوی چاردە بە هەڵکەوت بەسەر جۆگەلەیەکدا بازی دەدا وێنەی مانگی دە ناو ئاوەکەدا بەرچاو کەوت، سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕی و کوتی: خوا بتکا وەقوربان ئەم ئاوە، ئەینا تەقەڵم لێنەدەدای.

❖ کاک محەممەدی برام گێڕایەوە: ئەسپێکم لە کابرایەکی زۆربلێ کڕی. هەتا بڵێی ئەسپی چاک و خۆشاژۆ بوو؛ بەلام دە ڕێگادا عادەتێکی زۆر پیسی بوو،تەنانەت دە گەرمەی غاریشدا هەر کە لە ڕاست سوار یا ڕێبوارێک ڕاهاتبام وەک تورمز لێدانی ماشێن کوتوپڕ و ناخافڵ ڕادەوەستا تا بزانێ من سلاو و چاکوخۆشی دەگەڵ ئەو ڕێبوارە دەکەم یا نا؟ ئەگەر کەسێکی ناشارەزا بەو عادەتەی سواری بووبایە کەوتنی دەو جورە وەختانەدا بەزامن بوو.

❖ جەلیلی شوان، گایەکی بە قیمەتێکی گران کڕیبوو. هەرچی دەیکرد قازانج هیچ مایەی خۆی نەدەکردەوە. هەرچی ڕۆژ بوو کە بە یان دادەهات دەیبردە مەیدان و

تا نیوەڕۆ ڕایدەگرت؛ بەلام دەگەل مشتەری لەسەر قیمەت نەدەسازا. وردەوردە گایەکە عادەتی گرتبوو هەر کە بەیان دادەهات بۆخۆی ڕێی بۆ مەیدان دادەگرت و لای نیوەڕۆیەش بۆخۆی دەهاتەوە. مشتەری هێندەیان چاو لە ددانی کردبوو تا بزانن چەند ساڵە، کاتێک کەسێک بۆ لای دەهات و لە مەزەندەی دەپرسی بۆخۆی لێوەکانی هەڵدەویزنی و ددانەکانی وەدەر دەخست و بە نیشانی مشتەری دەدا. (بۆخۆم ئەو گایەم دیبوو)

❖ بەڕەحمەت بێ بابم، ڕۆژێک جەماعەتێک باسی بە دەسەلات گەیشتنی کەسێکیان دەکرد؛ هەڵیدایە و کوتی: پیاو نۆکەری پیاوێکی پیاو بێ زۆر باشترە لەوەی کە ئاغای جەماعەتێکی خوێڕی بێ.

❖ دوو دز بڕیاریان دا شەوەکی بچن و هۆلی ماڵێکی ببڕن و گایەکەی بدزن. ئەو شەوە بە ڕەنج و ترس و زەحمەتێکی زۆر هەرچۆنێ بوو توانیان و گایەکەیان دزی، بەلام لە لایەکی دیکەوە دزێکی دیکە تەماحی دمو گایە کردبوو بە درەنگەوە هات و گەیشتێ بەسەر هەواری خالیدا کەوت و دیتی دیواری تەویلە بڕاوە و گای تێدا نەماوە. بە پەلە بە کۆلاناندا گەڕا تاوەکوو تووشی دوو دزەکە بوو گایەکەیان وە پێش خۆیان دابوو، بە پەلە خۆی گەیاندێ و بە کەلێنێکدا دوو سێ نقورچی گەیاندە گایەکەو کوتی: وەحا وەحا گایەکەی هەرسێکمان.

❖ نیوەشەو دزێک دیواری هۆلی ماڵێکی مەڕداری دەبڕی. شێتێک بەسەریدا چوو و پرسی ئەوە چ دەکەی؟ دز کوتی: هیچ ناکەم زوڕنای لێدەدەم. شێت کوتی: ئەگەر زوڕنای لێدەدەی ئەی بۆ دەنگی نایە؟ دز کوتی: پەلەت نەبێ ئەو زوڕنایەی من

لێی دەدەم بەیانی دەنگی دێ.

شێتە هیچی نەکوت و ڕۆیشتە پەی کاری خۆی، بەیانی کە لە خەو هەستا، هاوار و بانگ لە ماڵی خاوەنهۆڵەکە هەستا و هەموو خەڵکی ئاوەدانییان تێهاڵا، ڕێبوارێک کە تازە گەیشتبووە ئاوەدانی، لە شێتەی پرسی ئەرێ کاکە ئەو هەرا و گڵۆمە چییە؟ شێتە کوتی: نازانم بەڵام پێم وابێ دەنگی زوڕنای کابرای دوێنێشەوێیە.

❖ پێشینییان کوتوویانە: ئەو کەسانەی زۆر عەیبدارن بۆ شاردنەوەی عەیبی خۆیان بەردەوام عەیب لە خەڵک دەگرن.

❖ لە دارایەکیان پرسی جەنابت زیاتر چ وەختانێک نان دەخۆی؟ کوتی: هەرکات برسی بووم.

لە نەدارێکیان پرسی ئەی تو زیاتر چ وەختانێک نان دەخۆی؟ کوتی: هەرکات وەگیرم کەوێ.

❖ کاک حەمەدەمین قوڕەیشی کاریکاتۆریست و قسەخۆشی بۆکان دەیکوت: فەرقی زیندوو و مردوو دموەدایە: زیندوو قەبزی ئاو و بەرق و گاز و عەوارێزی شارداری و...ی بۆ دێ بەڵام مردوو تەنیا قەبزی ڕووحی بۆ دێ.

❖ ئینسان تا گەورەتر دەبێ دنیاکەی بچووکتر دەبێتەوە؛ ئینسانی گەورە وەک کێو وایە کە لێی نزیک بوویەوە بۆت دەردەکەوێ کە چەندە گەورە و بڵیندە، بەڵام ئینسانی ناو دەرکردووی بێ ناوەرۆک وەک تراویلکە وایە تا زیاتر لێی نزیک بێوە بە بچووکتریت دێتە بەرچاو.

❖ ئامینی زارا... دایکی عەلی سەعیدی بوو. عەلی دەگەڵ ئێمە لە شاری خۆیە دەرسی دەخوێند و هەر بە چەند ڕۆژان دایکی جارێک دەهاتە سەردانی، پاشان کە لە جێی سەربازی کرایە سپای دانیش عەلی وەبەر دێهاتی قوڕوە کەوت. هێشتا عەلی بەتەواوی دێیەکەی دیاری نەکرابوو و داو و دامەزراو نەببوو خاتوو ئامین خۆی گەیاندە قوڕوە عەلی لە دیتنی دایکی خۆشحاڵ دەبێ بەڵام دەڵێ: خۆزگە دایە لە هاتن هێندە پەلەت نەکردبایە بەڵام ئیجازە بدە تۆ لێرە لە کارێژ چاوەڕوانم بە من دەچمە نێو شار هێندێک کەلوپەل و خواردەمەنی پێویست دەکڕم و دەگەڕێمەوە. عەلی گێڕایەوە: پاشی نزیک بە سەعاتێک کە گەڕامەوە لای دایکم وەزعی گاڕاج شێوابوو. ئەوانەی لەوێ بوون هەروا دەگەڕان و تێکیان داویشت، لە یەکێکم پرسی چ خەبەرە؟ ئیشارەی بە دایکم کرد و کوتی: ئەم ژنە بێچارە غەریبە، منالێکی لەگەلا بووە چووە چت بسێنێ (شت بکڕێ) ڕۆیشتووە و نەگەڕاوەتەوە، ئاخرزەمانەیە، لێیان نەدزیبێ باشە. عەلی کە لە چاو خەلکی نێو شار دەتکوت حووجە لە دوورەوە ئیشارە بە دایکی دەکا و دەڵێ: ئەوە هاتمەوە، خاتوو ئامین کە چاوی بە عەلی دەکەوێ ئامێزی بۆ دەکاتەوە و دە باوەشی دەگرێ و هەرا لە جەماعەت دەکا: بە قوربانتان بم چیدی مەگەڕێن منالەکەی خۆم دیتەوە، خەڵکەکە کە تا ئەو کاتی دە خەیاڵی خۆیاندا بە شوێن منالێکی سێ‌چوارساڵانەدا بە نێو مینی‌بووسەکاندا گەڕابوون لە دیتنی عەلی بەو قەلافەتەوە سەریان سووڕ دەمێنێ و یەکێک بە قوشمەیی دەڵێ: میمکە منالەکەت ئەوەنە بێ ئەشێ گەورەکەت چەندە بێ؟!

❖ بە هەڵکەوت لە ئیدارەی کەشاوەرزی (کشت‌وکاڵ) بووم، بڕیار بوو دوو جۆر قەرز بدەن بە وەرزێران: کووتا موددەت و تەویللەلموددەت (کەمخایەن و درێژخایەن)، یەکێک لە وەرزێران کوتی: من دەزانم کووتاموددەت یانێ دەبێ دە ماوەیەکی کورتدا

ئـەو قـەرزەی بدەینـەوە بـە ئیـدارەی کەشـاوەرزی بـەلام هـەرچی دەکـەم لـەو تەویلولموددەتەی حالی نابم. ڕەفیقێکی قۆشمەی دەگەڵ بوو کـوتی: تەویلـەلموددەت یانی ئەگەر ئەو قەرزەت وەرگرت و بۆت نەدراوە و وەبن سووتی بانک کـەوتی دەتگـرن و دە تەویلەت دەکەن.

❖ کابرایەکی سووتخوری دەسبڕی زۆر خراپ لەو سابلاغەی بـوو. وەختـی حـەج هات و خوا دە دلی نا بچێتە حەج. پرسی بە چەند مەلایان کرد، هەموویان کوتیان: ئـەو پوولـەی تـۆ لـە ڕێـی حەرامـەوە پەیـدا بـووە و بـۆ حـەج نابـێ. ئـاخری ڕۆیشـتە لای مەلاحوسێنی مەژدی و پرسی بەو کرد. مەلا حوسـێن بـە پێچەوانـەی هـەموو مـەلاکان کوتی: برۆ حەجەکەت بکە، لێت مبارەک بێ. کاتێ مەلاکان ئەوەیان بیستەوە بۆ گلـەیی ڕۆیشتنە لای مەلاحوسێن و هۆی ئەو فتوا نادروستەیان لێ پرسی، مەلا حوسـێن زۆر بـە ڕووخۆشی کوتی: منیش دەزانم حەجەکەی وەبەر ناکەوێ بەلام لێی گەڕێن بـا بـڕوا بـە لانیکەمەوە دمو سەفەرەدا سێ مـانگی پێـدەچێ و ئـەو ماوەیـە خەلـک لـە دەسـتانی دەحەسێنەوە.

❖ شێخ محەممەد کوڕی شێخی بورهان دە زەمانی خۆیـدا پیـاوێکی هەلـکەوتە و نوکتەدان و بـە کیفایـەت و خـۆش‌مـەجلیس بـووە. ڕۆژێـک کابرایـەکی خەلـکی دێـی قوولەسەن میوانی دەبێ، شـێخ موحەممـەد ڕووی تێـدەکا و دوای بـە خێرهێنـان لێـی دەپرسێ خەلکی کوێی؟ کابرا دەلێ: قوربان قولەسەنیم، شـێخ محەمـەد دەسـتێک بـە ڕدێنی‌دا دێنێ و دەلێ: یاڕەببی زۆر شوکر کە قوولە، سە، نی.

❖ دۆمێک مشتەی دە هەمبانە نابوو لـە بـەر چـاوی خەلـک بـەو هەمبانەیـە لـە

ژنەکەی دەدا. هاواری ژنە ڕێگە ڕۆژێک دەڕۆیی. جەماعەت لۆمەی ژنەیان کرد و کوتیان: کچێ ئەو مەکروماجەرایەت لە چییە؟ خۆ ئەو کابرایە بە هەمبانە لە تۆ دەدا و هەمبانەش ئەوەندە نایەشێنێ کە تۆ هاواری بۆ دەکەی؟! ژنە کە هەروا دەگریا و هاواری دەکرد دەیکوت: بابان وێرانینە ئێوە چوزانن ئەوەی دە هەمبانەدایە منی کوشتووە.

❖ لە پیرێژنێکی پیر و پشتچەماوە(کووڕ)یان پرسی: دایە پیرە، پێت خۆشە جحێڵ بێوە و پشتت ڕاست بێتەوە، یا ئەوەی هەموو ژنانی دیکە وەک تۆیان بە سەر بێ؟ پیرێژن کوتی: تازە جحێڵبوونەوەم خەون و خەیاڵە بەڵام حەز دەکەم بمێنم و ببینم کە تەواوی ژنانی دنیا وەکوو منیان بە سەر هاتووە، جا ئەو کات بەو چاوەی کە لێمیان ڕوانیوە لێیان بڕوانمەوە.

❖ دز پێچ و کڵاوی کابرایەکی دڵپاکی ڕفاند، کابرا بە سەری ڕووتەوە ڕۆیشتە گۆڕستان و لەوێ دانیشت. کوتیان: لە بازاڕ پێچ و کڵاویان لێ ڕفاندووی بۆچی هاتوویە ئێرە؟ کوتی: ئەی بچمە کوێ لێرە باشتر؟ دڵنیام سەرەنجام ڕێی دێرە دە کەوی.

❖ کابرایەکی قسەخۆش گێڕاویەتەوە: دە سەرەتای دامەزرانی قانوونی مەشرووتەدا میوانی ماڵێک بووم. خانەخوێم کچێک و پیرێژنێک بوون. پیرێژن پرسی ئەرێ کاکە لە هەموو جێیان باس باسی مەشرووتەیە مەبەست لە مەشرووتە چییە؟ کوتم: یاسا و دەستووری تازە.

کوتی: بۆ نموونە؟

لێی کەوتمە جەفەنگان و کوتم: بۆ نموونە کچی جحێڵ دەدەن بە پیاوی پیر و ژنی پیر دەدمن بە کوڕی جحێڵ.

کچە کە ڕەنگێکی هێنا و برد و کوتی: جا بە زیادم نەکرد ئەوە کوێی یاسا و دەستوورە؟!

پیرێژن لێی هەڵچەرخا و کوتی: ئای ئای لەو بێحەیایەی! وای لێهاتووە ئیراد لە یاسا و دەستووری مەشرووتەش دەگرێ!

❖ لە شار وشتریان بە سۆغرە دەگرت ڕێوی لە ترسان ڕایدەکرد. پرسییان لە چی دەترسی؟ کوتی: مەگین نابینن وشتری بە سۆغرە دەگرن؟ کوتیان: جا بە تۆ چی خۆ تۆ وشتر نی، کوتی: تا پێیان دە سەلمێنم ڕێویم و وشتر نیم کەولم لە حاجەت دەخەن.

❖ ئاغا و نۆکەرێک پێکەوە چوونە ڕاو. ئاغا کوتی: کورە عەیز ئەگەر تەماڵمان هەستاند نەکەی تەقەی لێنەکەی نایەنگێوی، لە خوڕا حەرامی مەکە با لەکیسمان نەچێ. عەیز کوتی: بەچاوان. هێندێک گەڕان لەپڕڕا عەیز کەروێشکێکی هەستاند و خۆی بۆ ڕانەگیرا و قامکی بە پەلاپیتکەی داهێنا، کەروێشک پاریزی نەدا و لە کیس ئاغای چوو. ئاغا بە تووڕەیی کوتی: ئاخر نەفام نەمکوت تەقەی لێ مەکە نایەنگێوی؟

عەیز کوتی: ئاغا ڕاست دەفەرمووی، نەمئەنگاوت؛ بەڵام بە سەری تۆ تەرخی ئەو دۆڵەم پێکرد.

❖ کوێستانی ئەستەڕ نزیک ئاوایی بێنگوینی مەهاباد یەکێک لە کوێستانەکانی هەرەخۆشی کوردوستانە. ڕۆژێک پیاوێک بۆ مەندۆکان دەچێتە ئەو کوێستانە. بەختی خۆی تووشی گیسکێکی بێخاوەنی بەجێماو لە هەوارچییان دێ. دەیباتەوە ئاوایی و پاش ئەوەی چەند ڕۆژێک دەست ڕادەگرێ و خاوەنی بۆ پەیدا نابێ دەیکوژێتەوە.و

ماوەیەک بە گۆشتەکەی ڕایدەبوێرێ. لەمەو بەدوا لێی دەبێتە عادەت هەموو سالان دەو کاتەدا کە ڕێی دەکەوێتەوە ئەو شوێنە بە تەمای دیتنەوەی گیسکی دیکە بانگ دەکا: کریس کریس، پاش چەند سالان ڕۆژێک کابرا دروست لەو شوێنەی کە بە دوای گێسکی دیکەدا دەگەڕا ورچێک لێی ڕاست دەبێتەوە و هەڕای دەکاتێ و هەتا نزیک مالانی ڕەپێ دەنێ، ئیدی کابرا تەمبێ دەبێ و بۆ هەتاهەتایە لەو شوێنە بە دوای گیسکدا ناگەڕێتەوە و کریس کریسی نالێتەوە. (کریس کریس وشەی تایبەتی بانگ‌کردنی بزن و کارلەیە).

❖ سالان وەزع و گوزەرانی خەلک هێندە خۆش نەبوو و لەو خۆراکییانەی کە ئێستا بە لانی‌کەمەوە دە شەو و ڕۆژدا جارێک دەیخۆین ئیوا بوو بە سالیش دمی لێ نەدەدا. لە یەکێکیان پرسیبوو دە نێو خۆراکی دنیادا کێهەیان لە هەموویان خۆشترە؟ کوتبووی پلاو.

پرسیبوویان چوزانی پلاو خۆشە ئایا قەتت خواردووە؟ کوتبووی ناوەللا بۆخۆم قەتم نەخواردووە بەلام کاکم دەیگێڕاوە دەیکوت برادەرێکم چاوی لێبووە سالێک لە دیوەخان خواردوویانەو و بەکەیفێیان بووە.

❖ عومەرخانی دەومشاری یەکێک لە قسەخۆشەکانی کوردستان بوو. خوا یار بێ دە بەرگەکانی دیکەی ئەو کتێبەدا زیاتر یادی دەکەین. ئەو کاتە کاکەفەتاحی ئەمیری لە شار خەریکی خوێندن دەبێ، عومەرخان پوولێکی دەداتێ تا کاتی هاتنەوەی لە شارڕا چەند گەزی مەخمەر بۆ بێنێ، بەلام کاک فەتاح کە دێتەوە شار وردەوردە پوولەکە لە بەرەوە خەرج دەکا و هیچی ناهێلێتەوە. کاتی گەڕانەوەی بۆ دەومشار هەر دوو لا بێدەنگەی لێدەکەن و کاک فەتاح لای وا دەبێ کە عومەرخان پوول و مەخمەری لە بیر

نەماون. ڕۆژێک فەتاح سەر و سەکوتی زۆر قرژن دەبێ پوولی دەدەنێ تا بچێتە لای سەلمانی و تووکی سەری قولە کاتەوە. فەتاح بە دڵخۆشی پوولەکە وەردەگرێ و دەردەکەوێ عومەرخان هەرای لێدەکا: فەتاح‌گیان ئەگەر تووکی سەرت لێدا مەخمەری لێیدە.

❖ کابرایەکی خراپی سووتخۆر دەمرێ و بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کفن و دفن دەیبەنە مزگەوت و دەنگی قورئان لە بڵیندگۆی مزگەوت بەرز دەبێتەوە، قسەخۆشێک بە بەر دەرکی مزگەوتدا ڕادەبرێ لە خزمەکانی مردوو دەپرسێ ئەو قورئان‌خوێندنە بۆ چییە؟ دەڵێن: فلانەکەس ئەمری خوای بەجێ‌هێناوە. ئەویش دەستێک بە ڕدێنی دادێنێ و دەڵێ: یارەببی زۆر شکوور، خوا عەفووی کا، نەمردم و ئاخری دیتم کە ئەو خزمەی ئێوە ئەمرێکی خوای بەجێهێنا.

❖ بەڕەحمەت بێ ئەحمەدە پیرەپیاوێکی بەساڵاچوو بوو دە قسەکردندا زۆری پەلە دەکرد و زۆر جار تێکەڵی دەکرد. ڕۆژێک کە نەقڵی خۆی بۆ دەگێڕامەوە تێکەڵی کرد و کوتی: تاریک و ڕوونی بەیانی هەر کە کەرەکان قیلاندیان بارم لە کەڵەبابەکان ناو بەرەو دەشتی مردوواوێ وەڕێکەوتم.

❖ عەلی خەندان بۆی گێڕامەوە:ماڵم لە حاجی لەکی بوو بەهار درەنگ و جەنگەی داوەتێ نەمابوو، دەستەنگی و نەداری هێرشی بۆ هێنابووم. ڕۆژ نەبوو منداڵ داوای گۆشتم لێنەکەن بەڵام من لە بەر نەدارییان جگە لە پیش‌خواردنەوە هیچی دیم لە دەست نەدەهات. وردەوردە هاوین داهات، کابرایەکی نێو ئاوایی گایەکی دەبەر نیردا مرد، بۆ وەی زەرەری لێنەکەوێ هێنایە بەر دەرکی مزگەوت و کەوڵی کرد و تەرازووی

لە پاڵ دانا بەڵام هەتا ئێوارێ دە کیلۆی لێ نەفرۆشت. سوورەتاوی هاوین بە درێژەی ڕۆژ لە گۆشتەکەی دابوو و ڕەشی هەڵگێڕابوو دەگەڵ سەگێک بەرامبەر بەو گۆشتە هەڵتروشکابووم ئەو لە ترسی تەور و پلاری کابرا و من لە بەر نەداری خۆم هیچمان نەماندەوێرا لە کەلاکەکە نزیک بینەوە. ئاخری وڵات تاریک بوو و کابرا هومێدی بڕا، لێی نزیک بوومەوە و کوتم کاکە، کابرا لە خۆشی ئەوەی کەسێک پەیدا بوو و دواندی بە گەرمی ئاوڕی داوە، چوومە بن گوێی و کوتم: هێندێکم گۆشت بە وەعد و قەراری هەوەڵ داوەتی پایزێ دەدەیەی؟

کابراکە هیچ چار و عیلاجی نەمابوو کوتی: ئەرێوەڵڵا هەرچەندی بتەوێ دەتدەمێ. کاتێ ئەوەی کوت داهاتمە کلکی گایەکەو کوتم: جا کەوایە لێم هەڵێنە.

❖ کەمال گولابی کوتی: سەیدە کوێرەیەک بوو لە قەرەقشلاغ دەیگێڕاوە: ساڵان هێندەمان چاو بە گۆشت نەدەکەوت، چوارشەممۆ و چوارشەممۆ خەڵک دەچوونە حەفتەبازاڕ و ئەوانەی دەستیان ڕۆیبا بەشی ژەمێکیان گۆشت دەکڕی و دەیانهێناوە، هەموو ماڵان کوتک و بەردیان هەبوو. هەر کە دەبوو بە پاش نیوەڕۆی چوارشەممە تەپەتەپ دەکەوتنە گوشت کوتانێ، منیش فەقیر بووم دەستم نەدەڕۆیی و گۆشتم پێ نەدەکڕدرا، هەر لە ئێوارێڕا ماڵێکم هەڵدەنا و خۆم لێ خۆش دەکرد و پاشان قوڵەدارێکم دەس دەدایە و هەرام لە خێزانم دەکرد و دەمکوت: جانەوەر غار دە بەرە و فلانە ماڵی،جانەوەری خێزانم بە زیق و هۆڕ بەرەو ئەو ماڵەی بۆیم دیاری کردبوو غاری دەدا و منیش بە قوڵە دارەوە ڕەپێم دەنا تا خۆی دە ماڵەکە داویشت و منیش بە دوایدا، خانەخوێ وەک ئەوەی ئێمە جندۆکە دەستی لێوەشاندبین لێمان دەکەوتە بیسمیللا بیسمیللا و پاشان دایدەنیشاندین و هەوڵیان دەدا و بە زۆری ئاشتییان دەکردینەوە و لە ترسی ئەوەی کە نەکا تووشی کەتنێک بم و جانەوەری بکوژم بە زۆری بۆ کفتەخواردن

ڕاگیریان دەکردین، سەیرەکەی ئەوە بوو ماوەی چەند ساڵ ئەوە شێوە گوزەرانی من بـوو بەڵام قەت کەسێک نەبوو بپرسێ کـە ڕاسـت لـە هـەموو شـەوان بـۆچی شـەڕی مـن و خێزانم دروست دەکەوێتە شەوانی پێنجشەمۆی دوای حەفتەبازاڕ!

❖ ئێمە منداڵ بووین داشقەچییەک بوو ناوەکەیم لە بیر نەماوە لە مەیدانی ئـاردڕا باراشی دەبردە ئاشی حەسەناغا و مـام ئەحمـەد و لەوسـەرێڕا ئـاردی دێنـاوە مەیـدان. سەیر و سۆعبەتی مەیدان لە سەر ئەو کابرایە بوو. ڕۆژێک لە دووکـانی خالـەڕا باراشـیان لە داشقەکە دا و ئێمـەی بـزۆزیش بـە داشـقەکەوە نووسـاین. لـە هـەورازی ئاشـی مـام ئەحمەد کە ئێستاش شوێنەکەی دەستە و هەورازە کەری داشقە وەستا و پێی چەقانـد و هەر چوار سمی خستە ناڵێک و جووڵـەی لـە خـوی بـڕی. حـەوت هەشـت کـەس لـە عەلافەکانی مەیدانی ئارد کە هەمووو کەیخودا و پیاوانی یەکەیەکە بوون لە دەرکی ئـاش ڕاوەستا بوون. وەختایەک ئەو حاڵەیان دی وێکڕا هـاتن و شـانیان وەبـەردا و پاڵـیان بـە داشـقەکەوە نـا و وە سـەریان خسـت. کاتـێ داشـقە گەیشـتە حەوشـی ئـاش، کـابرای داشقەچی بە پێکەنینەوە هاتە پێشیان و کوتی: بەڕاستی مەمنوونتانم بەقوربانی ئـەو بـەر و باسکانەتان بم ئەگەر نەهاتبانە فریام ئەو داشقەیە لەو هەورازە قـەت بـە تاقەکـەرێک وە سەر نەدەکەوت.

❖ سـەیدڕەحمان ئاهمەنـد کـە ئێسـتا منـداڵانی شـۆرەتەکـەیان کـردووە بـە ئازادمەنیش گێڕایەوە: منـداڵ بـووین ماڵـمان لـە گوڵـیار بـوو عەیزەکەچەڵـێکی لێبـوو حەکایەتی بۆ دەکوتین ئەوەی دەیکوت هەمووی درۆ بـوو و بـە زۆری ڕاسـتییەکت تێـدا بەر گوێ نەدەکەوت بۆ نموونە دەیکوت: پادشایەک بوو چل کوڕی بوو هـەموویان مـردن ما پەنجایان؛ دەمانکوت چۆنـاوچۆن چـل بـن هەمـموویان بمـرن پـەنجایان دەمێـنن؟

دەیکوت: بە سەری نگۆ درۆیـان ناکـەم، دوایـە دەیکـوت: سـێ‌تفـەنگیان بـوو دوویـان شکابوون یەکیان چەخماخی نەبوو، چوونە ڕاوێ، سێ‌مراوییان دیتـەوە دوویـان مردبـوون یەکیان بێ‌ڕووح بـوو، بـە تفەنگـە بـێ چەخماخەکـەی تەقـە لـە تفـەنگی هـات ئـەوی بێ‌ڕووحیان کوشت. هاتن چوونە کۆنەخانوویەکی سێ‌دیزەیان دیتەوە دوویـان شـکابوون یەکیان بنی نەبوو، مراویە کوژراوەکەیان دەدیـزە بـێ‌بنەکەیـدا لێنـا، دانـەکـەی ڕۆیـی و ئاوەکەی ما، دەمکوت چۆن شتی وا دەبێ؟! دەیکوت: بە سەری تۆ درۆیان ناکەم.

❖ کابرایەکی شەڕانی و لۆتی چەقۆ تووشی ڕووداوێک بوو و کەوتە زیندان، پاشـی چەند مانگ نامەیەکی لە زیندان ڕا بۆ خێـزانی نووسـی: ئەی هاوسـەری خۆشەویسـتم لەوەی کە ئێستا زیندانی و دەبەند کراوم نارەحەت مەبە، چونکی زیندان جێگای شـێر و پڵینگانە. تۆ دەبێ بە بوونی من لێرە شانازی بکەی.

خێزانی وڵامی نامەکەی بەو جورە بـۆ نـاردەوە: خۆزگـە پیاوەکـە لـە جیـاتی شـێر و پڵینگەکەی نێو زیندان پشیلەیەک بای لە سەر هەرزاڵی ماڵێ پاڵت دابـاوە و نەتهێشـتبا مشک بە ماڵ و ژیانت وەر بن.

❖ وەستا مەحموودی پەرێ گێڕایەوە: منداڵ بووم بـابم لـە دەسـت‌دابـوو و وەک کاردار لە لای مستەفاغای شێخاغایی دامەزرابووم، لـە بـەر ئـەوەی سـەغیر و منداڵـێکی ئەهوەن و ئارام بـووم خۆشـی دەویسـتم و زۆری مایـە بـۆ دادەنـام. هـەموو جـاران کـە ویستبایان ماڵاتەکان ئاودەن لە کاردارەکانی دیکەی جیـا دەکردمـەوە و دەیکـوت: وەرە چاو لێکە و فێر بە، منیش هەموو جـاران دەهـاتم چـاوم لـە ئاوخواردنـەوەی ماڵاتـەکان دەکرد و ئەوەی ڕاست بێ ئەو کە دەیکوت فێر بە من هـیچ فێـر نـەدەبووم، دوای چەنـد ڕۆژ کە زانی دە مەبەستی ناگەم کوتی: تۆ چـاو لـەو گوێـدرێژەی کـە، لـە کنـەخۆ پێـی

دەڵێن کەر، بەڵام چاو لێکە چەند جوان و بە ڕێکوپێکی ئاو دەخواتەوە! چاویش لەو کەڵ و گامێشانە کە لە کنەخۆ گۆشتیان دەخورێ و شیر و ماستیان وە عەرز ناکەوێ چەندە نانەجیبانە دم و لمبۆزیان دە ئاوەێ وەر دەدەن! ئێستا بە سەری تۆ ئەو زەرفەی ئەو گوێدرێژە ئاوی تێدا خواردووەتەوە من ڕاحەت بێزم دێ ئاوی تێدا بخۆمەوە بەلام ئەو کانییەی ئەو کەڵ و گامێشانە ئاویان تێدا خواردووەتەوە هەرچی دەکەم دڵم هەڵیناگرێ و بێزم نایە ئاوی لێ بخۆمەوە، بنیادەم قەت نابێ غەڕڕە و لە خۆڕازی بێ و دەبێ ئەوەی لە بیر بێ کە کەر بە هەمموو کەریەتی خۆیەوە بنیادەم دەتوانێ شتی لێ فێر بێ. جا ڕۆڵە مەحموود گیان ئەوەی جوان لە من وەرگرە هەمیشە ئەگەر کارێکی جوانت چاو پێکەوت یا قسەیەکی باشت بیست کارت بەوە نەبێ کێ ئەو کارە جوانەی دەکا یا ئەو قسەیە لە زاری کێ دێتە دەر. ئاکار و قسەی جوان جوانە و بنیادەم دەبێ فێری بێ تەنانەت ئەگەر لە کەریش بێ.

❖ ڕەحمانی خۆشاواز کوتی: دەگەڵ برایمی حەمەشەریفی سیسێرێ ماشێنێکی بێنزمان بە شەریکایەتی کڕی و دە خەتی بانە سەردەشتدا دەستمان بە کار کرد. من شۆفێر بووم و ئەویش لە پشت پشتەوەی ماشێن دادەنیشت و ملی لە نارەنارێ دەنا. نێوانی سەردەشت و بانە دێی زۆر لێن و لە نزیک هەمموو دێیەکان جەماعەتێک ڕادەوەستان و چاوەڕوانی ماشێن دەبوون. هەمموو جاران برایم سەری لە پەنجەرەی دەبردە دەر و تێدەفکری و دەیکوت: شلی کەوە بزانم محەببەتم دەیانخوا؟ ئەگەر بە دڵی نەبان دەیکوت: لێی خوڕە محەببەتم نایانگرێ. ڕۆژی وا بوو ئەو سەرموسەرمان دەکرد تمەنێکمان وە گیر نەدەکەوت. جاری واش بوو مسافیرەکانی بە دڵ دەبوو هەرای دەکرد: پووڵیان لێ وەرمەگرە هەمموویان میوانی خۆمن. ئەگەر دەمکوت بۆ وا دەکەی؟ دەیکوت: کەسێک ئەگەر محەببەتت بۆی نەبزوێ پووڵەکەشی پیسە،

ئەگەریش محەببەتت بۆ کەسێک ببزوێ هیچیشت نەداتێ پیاو وادەزانێ ئەو دنیایەی پێداوی، ناچار بووم دەگەڵیم دەر نەبرد، مینیبووسەکەم فرۆشتەوە و خۆم لە شەریکایەتی ڕزگار کرد.

❖ برایم دانیش پڕوو کوتی: کاتێ ورەی کەسێک بە تەڵقین بەتایبەت لە ناوچەی سەردەشت دادەبەزێنن دەڵێن: کابرایان کردۆتە چۆلەکەی پاراستان.

دەگێڕنەوە: ئێوارەیەکی پایز جەماعەتێک لە پاراستان لە سەر بانێک ئاوری دەکەنەوە، دەو کاتەیدا چۆلەکەیەک بە سەر باندا هەڵدەفڕێ، ئەوانیش لێی دەکەنە قووله وعەیب لێگرتن. یەکیان دەڵێ: هاها خەریکە بەر بێتەوە، ئەوی دی دەڵێ کوڕە ئێستا دەکەوێ و لەو بابەتە، بە کورتی ئەوەندە عەیب لە هەڵفڕینی چۆلەکەکە دەگرن لە ناکاو چۆلەکەکە بەڕاستی بەر دەبێتەوە.

❖ مامۆستا یەحیا دانیش چەند ساڵێکە بەتەواوی دەستی لە دنیا بەرداوە و قورس و قایم بە خەتی خوا و ئایینەوە نووساوە. ڕۆژێک بۆی گێرامەوە: کاتێ ئادەم بە هۆی نافەرمانی خوا لە بەهەشت دەرکرا کەوتە وڵاتی سەرەندیب و بە ئەمری خوا هەموو باڵندە و گیانلەبەرانی دیکە دووریان لێکرد و ئادەم تاک و تەریک ماوە. پاشی چەند ساڵ پاڕانەوە لە دەرگای خوا تەڕنەبابیلە (پەڕەسللێرکە) زگی پێی سووتا و وردەوردە لە ئادەم نزیک بۆوە و ئادەم لە تەنیایی هاتەدەر. خوا بە شێوەیەک تووڕەیی خۆی بە پەڕەسللێرکە نواند و فەرمووی: بۆچی لە فەرمانی ئێمە لاتدا و لە ئادەم نزیک بوویەوە؟ پەڕەسللێرکە کوتی: یا باری تەعالا! چاوم لە ئادەم کرد تاک و تەنیا بوو، چاوم لە تۆ کرد تۆش هەر تاک و تەنیا بووی، ڕەوام نەدی کەسی دیکە جگە لە تۆ تاک و تەنیا بێ چوون تەنیایی هەر لە تۆ جوانە.

خوا فەرمووی لە پاداشی ئەو ولامە جوانەت وەها لە نەسلی ئادەمت نزیک دەکەمەوە بتوانی بێ ترس و خۆف دە مالی ئەواندا هێلانە هەلبەستی، چەقۆم لە سەر هەلگرتی و گۆشتی تۆم لە بەرەی ئادەمیزاد حەرام کرد.

❖ کاک عوسمانی قاسمی دەفتەرداری مەدرەسەی ئێمە بوو، جارجار دە نێو قساندا دەیکوت: خوا وەکیلی دە نێو گیای بەهاریدا قەیسی لە هەموویان خۆشترە. کاتێ باسی میوەشمان دەکرد، دەیکوت: دە نێو میواندا گۆشت لە هەموویان خوشترە.

❖ ساردی پاییز کابرایەک دەسنوێژی هەلگرتبوو لەپڕ سەگێک لە ئاو هاتە دەر و خۆی ڕاوەشاند و تەواو گلاوی کرد. حەوسەلەی خۆ خاوێن کردنەوە و دەسنوێژهەلگرتنەوەی دوبارەی نەبوو خۆی لە گێلی دا و نوێژەکەی دابەست و کوتی: ئیشاللا پشیلە بوو.

❖ ڕەسوو مەمۆ بۆی گێڕامەوە: چەرخی چەپگەرد هەلیداشتبوومە باغاتی ویلایەتی سەبزاباتێ و ئیزنی گەڕانەوەم بۆ ولات نەبوو. تەڕاکتۆرێکی چکۆلەم پێبوو سەمم لە باغ دەڕشاند، ڕۆژێک هەروەک ڕۆژانی دیکە خەریکی پڕ کردنی تانکێری تەڕاکتورەکەم بووم دوو چۆلەکە بە بالەفڕە خۆیان دەبەر تەگەرێ تەڕاکتۆرەکە ڕۆ کرد، بۆخۆشیان نەیاندەزانی چدەکەن. فکرم لێ پەیدا بوو کوتم دەبێ چبێ؟ وەدوایان کەوتم وەختایەک گەیشتمە مەخسەدیان سوورمارێکی گەورە سەری دە هێلانەکەیان نابوو خەریکی قووتدانی جووچکەیەک بوو دوو جووچکەش لە خوارێ دە ئاو کەوتبوون. بەغار لە تەڕاکتۆرەکە دابەزیم پەلەسوانە بوو هەلموەشاند گەیشتمە سەر مارەکە و سێچوار پێمەڕەی چاکم لێدا و کوشتم و لەوێم فڕێدا و جووچکەکانم لە جێی خۆیان

داناوە و ڕۆیشتمەوە کەرەتێ، قەتم شتی وا نەدیوە، چۆلەکەکان هەر دووکیان هاتبوونە سەر کاپووتی پێش تەراکتۆرەکە نیشتبوون و سەریان بە لارەوە نابوو و بە زمانی بێزمانی سپاسیان لێدەکردم. (ڕووداوێکی لەو بابەتەم بۆخۆم دیوە و ئەو قسەیەی لە قسەکەی من ڕاگیراوە.)

❖ ڕەحیم و ڕەحمان و حوسێنی شەخسە لە سەردەشت برا بوون پوولەکانیان لە سەرێک دانا و بە سێ کەسی دووکانێکیان کڕی و کورسی و حاجەت و حوجەتی تایبەتیان بۆ دانا و دە مەنجەلێکی گەورەدا ئاوگۆشتیان وە سەر نا و ویستیان دووکانی ئاوگۆشت فرۆشی وەڕێخەن.

ڕۆژی یەکەم کە کاریان تەواو دەبێ و دەیانەوێ مشتەرییان بەڕێکەن بە حوسێن دەڵێن جا خۆ نازانین چەندەی تێکەین و بە چەندی بفرۆشین، هەستە بچۆ هۆ و ئاوگۆشت فرۆشییە و ئاوگۆشتێک بخۆ و پوولەکەی بدە تا بزانین میزان و نرخ و قیمەتی چەندە؟ حوسێن دەچێ بۆ دووکانەکە و ئەوانیش ئاوگۆشتێکی بۆ دادەنێن، هەر کە کەچکی تێهەڵدەدا بەرسورکەیەک وەبەر کەچکی دێ، زۆر ماقووڵانە و بە سرتە دەچێ و بە خاوەن دووکانی نیشان دەدا، خاوەندووکانیش لەوەی کە ئەو کابرایە نەیکردووە بە هات و هاوار و مشتەری تێنەگەیاندوون زۆری سپاس لێدەکا و داوای لێدەکا دانیشێ، پاشان دە قاپێکی تایبەتدا ئاوگۆشتێکی پڕ گۆشت و تایبەتی بۆ دێنن. دەیخوا و هەڵدەستێ هەرچی دەکا پوولی لێ وەرناگرن، تێر و تەسەل دەگەڕێتەوە لای براکانی ئەوانیش بە پەلە بەرەو پیری دەچن و دەپرسن: دەی چەندی تێکەین و بە چەنەی بفرۆشین؟ ئەویش دەڵێ: مەزەندەی نازانم، بەڵام ئەگەر کەسێک بەر سورکەی تێدا ببینێتەوە دەبێ تایبەتی و پڕگۆشت لە پێشی دانێین و هیچی لێ وەرنەگرین.

❖ بەڕەحمەت بێ عەلی خوسرەوی کە لێیان دەپرسی چەند قەرزداری؟ دەیکوت: بیست هەزار و وردەیەک، کە وردەکەیان دەگەڵ حیساب دەکرد زۆر لە بیست هەزارەکە زیاتر بوو. ژنانیش قەت پێیان خوش نییە بلێن تەمەنیان لە بیست ساڵ بۆ سەرموەیە، هەر بۆیە دەڵێن بیست ساڵ و چەند مانگێکین، ئەگەر لێی بکۆلێوە دەبینی بیست ساڵ و حەوسەت مانگن.

❖ هەڤاڵ کوێستانی و جەوهەر کرمانج و مامۆستا ئەحمەد هەردی وچەند دۆستی دیکەی ئەودیو ماڵیان هاتبوو سەقز و لەبەر ئیش و گرفتی خۆم ماوەی ئەوەم نەبوو بچم و بە دوایاندا بگەڕێم. زۆرم هەوڵدا ژومارە تەلەفوونەکەیانم وە گیر کەوێ بۆم جوور نەبوو. وەک زانیبوومەوە هەڤاڵ لە من زیاتر دە هەولی ئەوەدا بوو ژومارە تەلەفوونی منی وەگیر کەوێ، ئاخری لە کۆڕێکی ئەدەبیدا لە بانە کە مامۆستا هەردیش لەوێ بوو دەگەڵ هەڤاڵ چاومان پێک کەوت و پاش تۆخۆش و منخۆش کوتم: برالە ئەرێ ژومارە تەلەیفوونەکەت لە سەقز چەندە؟ کوتی: بنووسە با لەبیرت بمێنێ ٦٨٤٩، ئەو جار ئەو پرسی ئەدێ ژومارە تەلەیفوونی تۆ لە مەهابادچەندە؟ کوتم: « ئەو سوتفەیەی بە چ حیسابێک دادەنێی؟ ئی منیش ٦٨٤٩.»

❖ کابرایەک بە میوانی ڕۆیشتە ماڵێک، ترێیان بۆ دانا، میوان هێشووی ترێی بە خڕی ڕەمل زاری نا، خانەخوێ کوتی: خواردنی ترێ ئاوا نابێ،ترێ دەبێ بە دەستێک هێشۆکەی بگری و بە دەستەکەی دیکەش دەنکەدەنکە لێی کەیەوە. دووسێ دەنکان لە سەربەری دەستت دانێی و دەزاریان باوێی، کابرا سەرێکی ڕاوەشاند و کوتی: ئەوەی تۆ ئەڵێی هەمرۆیە هەمرۆ (هەرمێ).

❖ ڕۆژی ٧٩/٤/٩ لە سنە بووین، دەگەڵ خدری برام و مەلا تۆفیق مینبەری چووینە سەردانی مەلا مەحموود ئیبراهیمی کە لە نەخۆشخانەڕا هاتبۆوە ماڵ. دوای نەهار بوو زۆریان بەخێر هێناین، مەلا تۆفیق ئەو نەقڵەی گێڕاوە: سێ کەس یەکیان نەهاری خواردبوو، یەکیان بەڕۆژوو بوو یەکیشیان نەهاری نەخواردبوو. بە میوانی چوونە ماڵێک، خانەخوێ ڕووی دەوەی نەهاری خواردبوو کرد و پرسی نەهارت خواردووە؟ کوتی: بەڵێ خواردوومە، خانەخوێ کوتی: یاخوا بەخێر بێی.
دووهەمی کوتی: من بەڕۆژووم، خانەخوێ کوتی: تۆ هەر زۆر زۆر بەخێر بێی (چونکی چاشی نەدەخواردەوە)، سێهەمی کوتی: من نەهارم نەخواردووە، خانەخوێ ئاخێکی هەڵکێشا و ملی بە لارەوە نا و کوتی: عیلاج نییە، قەی ناکا تۆش بەخێربێ.

❖ بابم ئەو نەقڵەی بۆ مامۆستا هێمن گێڕاوە: مارف حەتەم دەستەنگ دەبێ، فکر فکر چبکەم، چ نەکەم؟ ئاخری فکری خۆی ساغ دەکاتەوە دەزانێ شێخولئیسلامی گەورە (بابی مامۆستا هێمن) عەلاقەیەکی زۆری بە ڕاو و شکار هەیە، دەگەڕێ تاجییەکی بەرەڵلا دەدۆزێتەوە، دەیهێنێتەوە ماڵ و دەیشوا و ئیشکی دەکاتەوە و بە دیاری دەیباتە لاچین و دەڵێ قوربان ئەو تاجییەم بۆ هێناوی.
شێخولئیسلام کە دەزانێ مام مارف دەستەنگە دەستوور دەدا بارێک گەنم و بارێک ئارد و دانەوێڵەی تەواوی بۆ حازر کەن با کاک مارف بۆ منداڵانی بەرێتەوە.
کاک مارف خۆشحاڵ دەبێ بەڵام شێخولئیسلام دەڵێ دەبێ ئەوشەو میوانم بی، شەو لەوێ دەمێنێتەوە، بەیانی ساز دەبن دەچنە ڕاوێ، وەختایەک تەماڵی هەڵدەستێنن و تاجییان تێبەردەدەن هەموو تاجییەکان دەکەونە سەر تەماڵی بەڵام ئەو تاجییەی مام مارف هێنابووی لە پێش سواران مل لە سەمایە دەنێ، مام مارف کە زۆر لە کاری تاجییەکە توورە دەبێ دادەبەزێ و دەست دە تینتینۆکەی تاجی دەنێ و دەڵێ:

سەگی سەگباب ئێستا وەختی ئەوەیە؟ ئاخر نازانی دەنکی زموادم دەماڵێدا نییە؟
شێخولئیسلام دادەبەزێ و تاجی لە بن دەستی مام مارف دەردێنێ و دەڵێ: مەیخنکێنە ئەوەی پێم بەخشیوی لێت ناستێنمەوە.

❖ ئەرێ ببورە لە وڵاتی ئێوەش بە کەر دەڵێن: قوربان؟ بەڵێ قوربان.

❖ وەستا عەولای خەیات (فەرەیدوونی) گێڕایەوە: لە میراوێ کچێک سەرتۆپی هەموو کچانی ئەو ناچەیە بوو و نێوبانگی دە هەموو نەڵێن و دێهاتی دەور و بەر گەڕابوو. لە ناکاو ڕەدووی ناحەزترین تووکنتری پیاوی ناوچە کەوت. خەڵک لەو کارەساتە واقیان وڕما و نەقڵی ئەو ڕووداوە بوو بە نوقڵی مەجلیسان و هیچکەس ئەو کچەی بە ڕەفیقی ئەو کوڕە نەدەزانی و ئەو ڕووداوەیان باوەڕ نەدەکرد. کچە لە حەیفان ئەو شیعرەی دانابوو، بە حەیران و کەوتە سەر زار و زمانان: حەیران وەرە لە مێرگی قوڕێ، گەرنت شیلانی منە دەڕوێ، ئەمن بۆیەم عەلی میرزاقادری کردووە، هەتا حالەمی میراوێم پێوە بدرێ.

❖ قادری مەحمووداغای پیاوێکی زۆر ئاقڵ بووە، بە مەلا خەلیلی دەڵێ: ئەمن پێم سەیرە دەفەرمووی دوو ژنم هەبووە و شەڕم دەماڵێدا بووە!
دەڵێ: بۆ کاک قادر تۆ کە دوو ژنت هەیە یانی شەڕت دەماڵێدا نەبووە!؟
دەڵێ: هەر شەش‌تەلاقی قادری کەوتبن چەند ساڵە دوو ژنم هەن هەر تاقەجارێک بە شەڕ هاتوون.
مەلا خەلیل دەڵێ: ئولۆهی تەلاقت کەوت، جا چۆن شتی وا دەبێ؟ ئەمن هەموو دەمانم شەڕ دەماڵێدایە، ئەتۆ دەڵێی یەک شەڕیان کردووە! ئەویش دەڵێ: تەلاقم

نەکەوتوون، دەپرسی چۆن؟ دیسانیش هەر شەش‌تەلاقی قادری کەوتبن ئەو شەڕەی ڕۆژی هەوەڵییان دەس پێکردووە هێشتا نەمراوەتەوە و کۆتایی پێ نەهاتووە.

مەلا خەلیل دەڵێ: ئەشەدوبیللا تەلاقت نەکەوتوون.

❖ وختی کۆتری گاگمان دەبێ، کۆترێک بە جێ دەمێنێ، خەلک دەچن دەڵێن کاک قادر ساڵ درەنگانە و کۆترێکی گاگمە بەجێماوە و کۆچی نەکردووە. دەڵێ: بچن بەنی لە لاقی بێچۆکانی بکەنەوە، وەختایەک دەچن دەبینن منداڵ بەنیان دە لاقی بێچۆکان کردووە، بەنەکەی لە لاقی بێچۆکان دەکەنەوە، کۆتر لە شەقەی باڵان دەدا و دوور دەبێتەوە. (کاتێ منداڵ بووین منداڵ دەچوون هێلانەکۆتریان دەدیتەوە بەنێکیان لە لاقی بێچووی تازە لە هێلکەدەرهاتوو دەبەست و سەرەکەی دیکەیان لە شوێنێکی قایم دەکرد، کۆتری بێهەواڵ لە پیلانی بێچووی بنیادەم جووچکەکانی گەورە دەکرد کاتێ گەورە و دانەخۆرە دەبوون بەر لەوەی هەڵفڕن دەچوون لێیان دەکردنەوە و دەیانهێنانەوە ماڵ، ئەڵبەت ئەو کارە منالانی بزۆز و نەعاملاو دەیانکرد دەنا کۆتر دەنێو کورداندا بە باڵندەیەکی بێئازار ناسراوە و زۆربەی گەورەکان لەو پیلانەی منداڵان بێهەواڵ بوون).

❖ حاکمی سەردەشت بە دوای کاک قادردا دەنێرێ. بەلام پێی‌دەڵێن هەرکەس بیەوێ حاکمی سەردەشت ببینێ دەبێ کاغەزی پوور کۆچەری پێبێ دەنا ڕێی چوونە لای نادەن. (پوور کۆچەر حاکمی کالەدەرێ بووە) کاک قادر دەڵێ: ئەمن لە گۆمانی وەدەرکەوم بچم بۆ کالەدەرێ تەگبیرم بکەوێتە بەرچەنگی پوور کۆچەرێ، دەبێ لە کن حاکمم چ بە سەرێ؟

❖ باسی تاقەت و هێزی بـەعزە وەرزیشـوانێکمان دەکـرد بەڕەحمـەت بـێ بـابم گێڕایەوە: یەحیای مام شەخسەی خەڵـکی شـێنیە بـوو گـەنمی نـەمابوو، بـڕیاری وابـوو بچێتە هەولێر جەواڵەگەنمێکی بکڕێ و بیهێنێتەوە. قەراریش وابوو ئەو ڕۆژانـە داوەتێـک ساز بێ، یەحیا لەبەر ئەوەی زۆری دڵ بە داوەتەکـەوە بـوو لـە چـوون بـۆ ئـەو سـەفەرە ساوەساوی دەکرد، بەڵێنیان پێدا کوتیان: یەحیا بڕۆ سەفەرەکەت بکە تا تۆ دێیەوە ئێمـە داوەتەکەی ناگێڕین.

یەحیا بـە دڵـنیایی ڕۆیشـتە هـەولێر؛ بـەڵام وەختایـەک بـە کۆڵـەگەنمـەوە گـەڕاوە داوەتێک دەگەڕا سـەرووبنـی دیار نەبوو. لە داخان دەهـری بـوو، بـە کۆڵـەگەنمەوە چـوو دەستی سـەرچۆپی گـرت و ملـی نـا لـە هەڵـپەڕین و ئـەو بەندانـەی دوابـەدوای یەکـدا دەکوتن: یەحیا تا ماڵ نووستنان هەر هەڵپەڕی و کۆڵەکەی دانەنا:

بە دوگمی لە دۆ دانێ، بە تووژەڵە و نۆکانێ، یەسترم لێدەگری مانێ، بـە نەخشـی لـە جلەکەری، وەرنە سوێی تـەکانی مـن، گێوژیلـێ بەرتـەلانی، بـە بـار دەگـرێ گەڵـوانی، شووتی حۆلحۆلی پێوە، هـەتا تەشـقی عاسمـانی، کیسـەڵ دەفـڕێ بـە بـاڵان، شـووتی حۆلحۆلی پێوە، بێنە ڕەفیسکەت ماچ کەم بۆنی دۆشاوی لێدێ، لە سـەر پـردی نۆکانـێ، یەسترم لێ دەگرێ مانێ، ئای لە بۆنانی هەرزن، بـۆ دۆترشـی ئامانـێ، کیسـەڵ دەفـڕێ بەباڵان، لەبـۆ تەشـقی عاسمانـێ، لـەوێ دەکـا هێلانـێ، لەسـەر گلـۆپکی بێژانـێ، ئـای شێنیەشـێنیە شـێنیە، شـێنیەی شـێخەو وەتمـانی، شەخسـەو فەرخـە لـە مـاڵ نـین، چوونەتەوە کاروانی.

یەحیا دە نێوان هەر سێ چواربەنداندا توند بە لاقی ڕمبەی لە عەرز دێنـا و دەیکـوت: وەرنە سوێ تەکانی من، ئێستا بیری لێدەکەمەوە لام وا نییە ئەو کارەی یـەحیا کـردی و بە چاوی خۆم دیتم ئەورۆ دە تاقەتی هیچ پاڵەوانێکدا بێ.

❖ منداڵ بووم وەک هەواڵێک ئەوەم دە گۆڤارێکدا خوێندەوە: دایک و کوڕێک بوون یەکتریان زۆر خۆش‌دەویست. ڕۆژێک کوڕ دەگەڵ چوار کەس لە دۆستانی قەرار دادەنێ بچنە تاران، شەو دایکی خەتەرەی دەکەوێتە دڵ و لەبەر کوڕەکەی دەپاڕێتەوە: دەو دنیا ڕوونەدا تەنیا تۆ شک دەبەم دڵم بۆ ئەو سەفەرە ناچێ بە قسەی دایکی خۆت بکە بۆ ئەو سەفەرە مەچۆ، کوڕە لە سەر ویستی دایکی واز لە سەفەرەکە دێنێ و ڕەفیقەکانی دەڕۆن و بەجێی‌دێڵن.

بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر کوڕە دەچێتە دیوی تایبەتی خۆی و خەریکی هەڵوێژاردنی کتێبەکانی دەبێ و دایکیش بۆ کار و باری خۆی دەڕواتە بازاڕ، ئاگادار دەبێ کە ئەو ماشێنەی هاوڕێیانی کوڕەکەی سەفەریان پێکردووە لە نزیک شاری میانە هەڵدێراوە و هەر چوار هاوڕێی کوڕەکەی تێداچوون. دایک لە لایەک خەمباری لە دەسچوونی هاواڵەکانی کوڕەکەی و لە لایەکی دیکەوە شوکرانەبژێر و خۆشحاڵی ئەوە دەبێ کە کوڕەکەی بەشدرای ئەو سەفەرە نەبووە و بەو جورە لەو مەترسییە گەورەیە دەرباز بووە. بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە. دە درێژەی ڕێگادا بیر لەوە دەکاتەوە کە بە چ زمانێک ئەو هەواڵە ناخوشە بە کوڕەکەی ڕابگەیێنێ؟

بەڵام کە دەگاتەوە ماڵ دەبینێ کوڕەکەی لە پاڵ کتێبەکانی سەکتە لێیداوە و لە ساڵی خوا ڕاست بووەتەوە.

❖ ئاغا دەسەر ڕەعیەتەکانی کرد ماڵە و سەتمەنی بۆ بنێرن، خەلک خڕبوونەوە و پاش وتووێژێکی زۆر بڕیاریان دا نوێنەرێک دە نێو خۆیاندا هەڵبژێرن و بینێرنە لای ئاغا و بڵێن نایدەین، دە نێو خۆیاندا یەکێکیان هەڵبژارد و ناردیان، ئاغا بە گومانی ئەوەی ئەو نوێنەرە پووڵەکانی هێناوە دەستووری دا ڕێز و حورمەتی تایبەتیان لێگرت، پاشان ئاغا ڕووی تێکرد و پرسی پووڵەکانت هێناوە؟ نوێنەر کوتی: نەخێر، بۆیە هاتووم هەتا

پێتڕابگەیێنم خەلک دەڵێن نایدەین، ئاغا کوتی: من کـارم بـە خەڵـک نییـە، بۆخـۆت دەیدەی یا نا؟ نوێنەر کوتی: نەخێر، ئاغا دەستووری دا تێی‌هەڵدەن. نۆکەر تێی‌هـالان و کابرایان کوێزرکوت کرد. هێندەیان تێهەڵدا چیوای نەمابوو دەبن دەسـتیاندا بمـرێ، بـە دەست ئیشارەی کرد و کوتی: دەیدەم، دەیدەم.

پوولەکەیان لێوەرگرت و وەدەریان نا. نوێنـەر بـە لاکـەلاک ڕۆیشـتەوە نێـو ئـاوایی و جەماعەت لێی هالان و لـە حـاڵ و باڵـیان پرسـی، ئـەویش حاڵـی‌کردن کـە لـە سـەر نایدەمێک چی بـە سـەر هـاتووە! کوتیـان: دەی پیـاوی حیسـابی دابـات و نەتهێشـتبا هێندەت وێکەوێ! نوێنەر تووڕە بوو و کوتی: یانی چی؟ هەروا بە خۆڕایی دابام؟!

❖ دە مەسەلی کوردیدا هەرکەس بە کەیخودا گەڕێتی خـۆی کـار و موشـکیلەی هاسانی کەسێک لەوەی کە هەیە گرانتری کات، دەڵـێن فـلانی کـەرەی بـۆ کردووینـە زەنگ. ساڵێک لەشکر و قوشەنێک بە قەراغ دێیەکدا ڕادەبرن، فەرماندەی قۆشەن بـانگی کوێخای ئاوەدانی دەکا و دەڵێ ئێمە تا حەوتەیەک لـە نزیـک ئـەو دێیـەی ئێـوە وچـان دەدەین ئێوە دەبێ هەر ماڵەی سێ‌کیلۆمان ڕۆنی کەرە بۆ بێنن، کوێخا دەگەڕێتـەوە نێـو دێ و ئەو هەواڵەی بە خەلک ڕادەگەیێنێ، خەلک لە بیستنی ئـەو دەسـتوور و فەرمانـە ناڕەحەت دەبن و دەڵێن: ئەو داوایەی فەرماندە دەتوانایی ئێمەدا نییە و بۆمان جێبـەجێ نابـێ، فکـر فکـر دادەنیشـن نوێنـەر و کەیخودایـەک هەڵـدەبژێرن تـا پچـێ و دەگـەڵ فەرماندەی قۆشەن بدوێت. نوێنەر دێت و دەو بارەیەدا دەست بەَ قسان دەکـا. فەرمانـدە دەستوور دەدا بیگرن و کوێزر کوتی کەن، وەختایەک نوێنەر دەبینێ تووشـی تێهەڵـدان دەبێ لە ترسان دەڵێ قوربان سێ‌کیلۆ ڕۆنی کەرە سـەهلە دەسـتوور بـدە دەچـم پێیـان ڕادەگەیێنم کە دەبێ سێ‌کیلۆ ڕۆنی زەنگ بێنن، فەرماندەی قۆشەن کـە دەبینـێ ئـەوە زیاتر بە قازانجە بزەیکی دێتێ و دەڵێ:دە ماڵ کاول پێشتر ئەو قسـە و داوایـەت کردبـا،

جا چۆن من دڵم دێ قسەی نوێنەر و کەیخودایەکی وەک تۆ بشکێنم؟ (دە سازکردنی ڕۆنی زەنگدا ڕۆنی کەرە قاڵ دەکەن و دۆگ و شتانی زیادی لێ جیا دەکەنەوە، بۆ ساز کردنی سێ‌کیلۆ ڕۆنی زەنگ بە لانی کەمەوە سێ‌کیلۆ و نیو کەرە پێویستە).

❖ سەعیدخان هومایوون کوتی: یەکێک لە ئەمیرانی سامانی داوای لە میرزاکەی کرد بچێتەوە ماڵ و دە شێنەییدا نامەیەکی جوان بۆ شا بنووسێ، میرزا خەریکی نامەنووسین دەبێ ژنەکەی دێتە ژوور و دەڵێ: ئاردمان نەماوە، ئەویش بێ ئەوەی بیر بکاتەوە دە نامەکەیدا دەنووسێ: ئاردمان نەماوە، بەیانی کە نامەکە حازر بوو ئەمیر لێی وەرگرت و چاوی پێدا خشاند. لە دیتنی ئەو ڕستەیە سەری سووڕ ما و کوتی: ئاردمان نەماوە جێی دەو نامەیەدا نییە! ئەوە چییە نووسیوتە؟ کوتی: چ بکەم قوربان؟ دەستەنگم، کاتێ خێزانم کوتی: ئاردمان نەماوە بێ‌ئەوەی ئاگام لە خوم بێ ئەوەم نووسیوە. ئەمیر دەستوور دەدا ماڵی میرزای وا پڕکەن لە ئارد کە بە حاڵ جێی دانیشتنی خۆیان بێتەوە تا جارێکی‌دیکە میرزا دە کاتی نووسیندا بیر لە نەمانی ئارد نەکاتەوە.

❖ جاری وایە منداڵێک قسەیەکی وا دەکا دەگەڵ تەمەنی یەک ناگرێتەوە، ڕۆژی ٧٦/٧/٦ شەش‌ڕۆژ لە ساڵی دەسپێکردنی خوێندن تێپەڕیبوو کوڕێک هاتە قوتابخانە تا خۆی بۆ خوێندن نێونووس کا. مدیری مەدرەسە بیانووی هێناوە کە تۆ درەنگ هاتووی و جێگەمان نەماوە. کوڕە بە نارەحەتی ملی بە لارەوە نا و کوتی: مەن چ‌بکەم؟ لە کوورەخانە دەگەڵ بابم خەریکی فەعلەیی بووم ئەوە ئەرکی دایکم بوو دەبا هاتبا ناونووسی کردبام، زگمان پێی سووتا و داوامان لە دۆستان کرد بیانووی پێ‌نەگرن، دە کاتی نێونووسیدا پێویستیمان بە چەند زانیاری بوو، پرسیمان: نێو؟ کوتی: ئەحمەد

شۆرەت؟ بایەزیدی‌پوور
گەڕەک و شوێنی لێدانیشتن؟ باغی شایەگان
ژمارەتەلەیفون؟ تەلەیفونمان نییە، بەڵام بێ‌سیممان هەیە.
بە سەرسووڕماوی پرسیمان بێ‌سیمی چی؟
کوتی: دایکم، ئەی بێ‌سیم نییە چییە، ئاگای لە هەموو شتێکی ئەو شارە هەیە، ئاگای لێیە کێهەژن لەوسەری شار چ کراسێکی کڕیوە بەڵام ئاگای لە نێونووس کردنی من نەبووە.

❖ کابرایەکی کورد تووتییەکی دەبێ وەک خۆی کوردی دەزانێ، تووشی دەستەنگی دێ و تووتییەکەی بە عەجەمێک دەفرۆشێ. عەجەمە تووتییەکە دە ژوورێک دەکا و هەرچی بە عەجەمی دەیدوێنێ تووتییەکە جواب ناداتەوە. کابرا تووڕە دەبێ و لە قەفەس دەیهێنێتە دەر و دەیەوێ لە باڵێکی دەرێنێ، تووک و پەڕێکی زۆری لێدەکاتەوە؛ بەڵام تووتی خۆی دەرباز دەکا و هەرچۆنی دەبێ خۆی دەگەیێنێتەوە ماڵی خاوەنی هەوەڵێ. خاوەنی پێشووی کاتێ بەوجۆرەی دەبینێ بە پەشۆکاوی دەپرسێ ئەوە بۆچی وات بەسەر هاتووە؟ تووتی بە ناقایلی دەڵێ مەعلوومە، لە سەر کوردایەتی!

❖ کابرایەکی سابڵاغی کە ماوەیەک لە تاران دەبێ، زۆر وەڕەز دەبێ. ڕۆژێک پەنجەرەی مسافیرخانە دەکاتەوە. لە سەرداری پێش پەنجەرە چاوی بە چولەکەیەک دەکەوێ، هەناسە و ئاخێک هەڵدەکێشێ و دەڵێ: ئای جەرگت دەخۆم چۆلەکە، کلکت دە تاران کردووە و ڕووت دە شاری.

❖ هاوینی ٧٦ لەبەر گرفتی خۆم ناچار بووم سێجار بچمە کوردوستانی باشوور. سەفەری دووهەم بە قاسمەڕەشدا ڕۆیشتم. ناسیاوێک لە بازاڕی قاسمەڕەش منی بە کابرایەکی عێراقی ناساند و کوتی: ئەوە برای حەمەیە، ئەوەی دە تلەویزیۆندا تەمسیلان دەکا، هەتا قلادزێ ئاگات لێی بێ لەوێڕا بۆخۆی بەڵەدە. کابرا لە بیستنی ناوی حەمە وە پلەزیقان کەوت و بە پێکەنینەوە پرسی، ئەرێ حەمە ماوە؟

ئەو پرسیارەم لە دڵی گران هات و کوتم: ئەرێ وەڵڵا شوکر بۆ خوا ساغ و سەلامەتە و نێوی عەسڵی خۆی خدرە و دووساڵیش لە من بچووکترە. کابرا بە سەرسووڕماوی کوتی: ئەدی بۆ دەڵێن خانباغی تەسادووفی کردووە؟!

❖ مەعموورێکی زالم ڕێی کەوتە دێیەک، جگە لە پیاوێک کە ئەویش لە هاتنی مەعموورە ئاگادار نەبوو ئەوانیدی هەموو لە ترسانی هەڵاتن. مەعموور کە نێوبانگی زاڵمێتی خۆی بیستبۆوە و شانازی پێوە دەکرد. کاتێ چاوی بەو پیاوە کەوت زۆر تووڕە بوو وکوتی: تۆ لەسەر چ مەزەبێکی کە لە هاتنی من نەترساوی؟ کوتی: من لە سەر مەزەبی وەرزێرانم، هەرچی بیچێنی دەیدروویەوە، هەرچی بمدەیەی دەتدەمەوە، هەرچی پێم بڵێی پێت دەڵێمەوە.

❖ کابرایەک کەوتە حەدوسەری مردنێ، وەسیەتی کرد: دە کفن و خەڵاتی کۆنمەوە پێچن با مەلایکان وا بزانن مردووی کۆنم و نەیەنە سوال و جوابم.

❖ کابرایەک ڕۆیشتە لای مامۆستا و کوتی: قوربان ئافتاوەیەکم هەیە بنەکەی کونە. پڕی دەکەم لە ئاو دەچمە سەر پێشاوێ، هەتا لێدەبمەوە هەموو ئاوەکەی لێدەچێ و هیچی تێدا نامێنێ تا تارەتی پێبکەم. هاتوومە خزمەتت بزانم دەکرێ

دەپێشدا تارەتەکەی بکەم، دوایە خەریکی پێشاوەکەی بم یا نا؟

❖ کابرایەک جەوالێک جۆی لە کەرێک نابوو و خۆشی لە سەری سوار بوو. کەر دەبنیدا وەستا، دابەزی جەوالەکەی لە کۆلی خۆی نا و سواری کەرەکە بۆوە، دیسان کەر پێی چەقاند و نەڕۆیی بە تووڕەیی تێی وەژاند و دەنگی لێ هەڵێنا: ئاخر کەری دێزە بارەکەیە لە کۆلی خۆمە، ئەو جار بۆ ناڕۆی؟

❖ لە فەقیرێکیان پرسی: دە فکری چیدای؟ کوتی دەمەوێ کچی شا بخوازم. پاش قەدەرێک بە گاڵتە لێیان پرسی دەی دەگەڵ کارەکەت چیت کردموە؟ کوتی: شەرتی خواستن و زەماوەند ڕازی بوونی دوولایەنە، شوکور بۆ خوا نیوەی کارەکەم جێبەجێیە چونکی بۆخۆم ڕازیم، ماوەتەوە ئەو

❖ قەدیمی کوتوویانە: پیاو پێشەنگی قەل بێ دندووکی دەچێتە نێو پیسایی. تەماح و پیاوەتی یەک ناگرنەوە. چێشتی پیاوان درەنگ دەکولێ، مەوتەن گولی کا بە کرێ هەرچەند لێی دوور کەوێوە ئاخری بۆی دەگەڕێیەوە. زەوی کە ڕەق بوو گا لە گای دەزانێ، کار لە پیاوان دەقەومێ.

❖ قەدیم لە دێهات و بەتایبەت لە نێو مەنگوڕان پارەوپووڵ داب نەبوو. خەڵک زیاتر ئەو بەرهەمانەی کە دەیانبوو پێکتریان دەگۆڕیوە، وەک کووزەڵە بە نان و گەنم بە هەرمێ، زۆر جار بە تەرازوو پێکیان هەڵدەسەنگاندن و سەربەسەر دەیانگۆڕینەوە.

کاک عومەر یەزدانفەڕ گێڕایەوە: خاڵەمینەیەک لە گاگەشڕا ترێی هێنابوو و لە «کامەم» یەک بە خۆی هاواری دەکرد: وەرە ترێ، بۆ دەوڵەمەندی سەربەسەر و بۆ

فەقیری یەک بە دوو، خەڵک لایان وابوو پێچەوانە حاڵی بوون، جوانتریان گوێ دەدایە، کاتێ باش لێی حاڵی بوون، کوتیان: جا چۆن خاڵەمینە بۆ فەقیری یەک بە دوو؟ ئەتۆش دەتەوێ زوڵم لە فەقیری بکەی؟!

خاڵەمینە کوتی: بۆ بەتەمان تازە ئەمن باری فەقیری بە ترێی ڕاست کەمەوە؟ ئەرێ وەڵلا ئێستاش دەڵێم بۆ دەوڵەمەندی سەربەسەر و بۆ فەقیری یەکبەدوو.

❖ کاک کەریم مەولوودی کوتی: دۆستێکمان کوڕەکەی ببوو بە دوکتوری تایبەتی مندالان. ئەو ڕۆژەی کە مەتەبی دانا، دەر و جیران و دۆست و ناسیاو بۆ پیرۆزبایی پێیەوە چووین. یەکێک لە هاوڕێیان کە تەمەنی زۆر و نەخوێندەوار بوو کوتی: ئیشاڵلا هەروا نامێنێتەوە، بەڵکوو بە سەلیقە بێ و بتوانێ گەورانیش چا کاتەوە.

❖ برایمی مەلاخدری ئەو نەقڵانەی بۆ گێرامەوە: جەعفەر کوڕی حاجی مینەی مەمەنداوێ لە سەربازی هاتەوە. بابی سەتهەزار تمەنی دایە تا دەست بە کاسبی بکا. ئەو کات نەفت و شەکر و بێنزین بۆ عێراقێ دەچوو. جەعفەر ملی دەبەر ملی ئەوکارە نا و بە دوو سەفەران هەموو دەسمایەکەی بوو بە زەرەر و گەڕاوە ماڵ. بەڵام بۆ ئەوەی بە خۆدا نەشکێتەوە کەس دەوبارەیەدا قسەی دەگەڵ نەدەکرد.شەوێک بە بێوازی لە سەر گازەرای پشت درێژ ببوو، حاجی مینەی بابیشی لەوێ بوو. چەند مێشوولە دەدەوری لامپەکەی ژوورێ هاڵابوون هەڵدەفڕین و دەنیشتنەوە. جەعفەر لە سەر بەدبەختی خۆیڕا زگی بەوان دەسووتا کوتی: ئای خوایەگیان دەبێ ئەو مێشوولانە بە چی بەڕێ چن؟ حاجی مینە کە تا ئەو سەعاتی خۆی ڕاگرتبوو و باسی ئەو زەرەرەی دەگەڵ نەکردبوو، کوتی: مەعلوومە، بە شەکر و نەفت و بێنزینی بەڕێ دەچن (یانێ لەوانەت زەرەر کردووە).

❖ لـە گونـدی مەمەنـداوێی سەردەشـت مامۆسـتای قوتابخانـە بـووم، لـە پـۆلی یەکەمی سەرەتایی کچێکی قژزەردی جوان بە نێـوی زریـان قوتـابیم بـوو، دەسـتەکانی لەسەر کورسییەکەی پێش خۆی دانابوو چەنەی وە سەر پشتی دەسـتی دابـوو و چـاوی لە دیمەنی لەوحە (عەکسەکان) دەکرد ، بـۆ ئـەوەی منداڵـەکانی دیکـە بێـدەنگ کـەم شولکێکم لە کورسییەکەدا، زریان ڕاچەنی و گوتی: ئای هەتیوە گولە خۆ وەختـە بـوو لـە دەستمی ڕاکێشی!

❖ لە گوندی دیوالان پیاوێک بە نێوی خاڵ باقی دە سـەردەمی لاویەتیـدا بـە ژن بە ژنەکچێکی بۆ دەگوێزنەوە. شەو بە ڕەسمـی کـوردەواری خـاڵ بـاقی دەپـاڵ بووکـێ دەکەن، بەڵام کچە خۆ بە دەستەوە نادا و هەتا بەیانی هەرچۆنی دەبـێ دەیگوزەرێنـێ و بوولێڵەی بەیانی هەڵدێتەوە ماڵی بابی. زۆریان پێ سـەیر دەبـێ و دەڵـێن: بـەو بەیانـە زوویە بۆ هاتوویەوە؟ ئەویش مل دەنێ لە گریان و دەڵێ: بشمکوژن ناچمەوە، شەوی ئـەو شەو نەنوستووم، بە خودای لە سەریشم دەن دەگەڵ پیاوی خەڵکی خەوم لـێ ناکـەوێ، ئیستاش کە ساڵی ١٣٨١ی هەتاوییە هەردووکیان ماون بەڵام زۆر پیر وکۆنساڵن. خـاڵ باقی هەروا کوڕ و بووکیش هەروا کچ ماوەتەوە.

❖ حەسەن مەولوود خەڵکی سـیاقۆڵ بـوو، بـۆ کـار و پەیـداکردنی بژیـو چووبـوو کوڕەخانەی تەورێز، عەجـەمێکیش نێـوی حەسـەن بـوو کـاری نێـو مەیـدانانی دەکـرد (کەرسەک و بەردی فڕێ دەدان و جێی خشت پێژانی خۆش دەکرد) ڕۆژێـک حەسـەن عەجەم سواری دووچەرخە بە نزیک مەیدانـدا دەهـات. کـاک حەسـەن مـەلوود گـوتی: مەشەدی حەسەن ئەوە میچی ماڵ؟ حەسەنعەجەمیش کـە لێـی حاڵـی نـەبوو گـوتی: نەمیرەم خانە.

❖ مستەفا سۆفیزادە (کاسب) خەڵکی ئاغەڵانی سەردەشت، ڕۆژێکی زۆرمان لە بەر پاڕاوە، کوتی: ئەگەر چوونەوە مەهاباد دەبێ نایەیەکم بۆ بێنن، کاک حوسێن ڕەسوولی و برایمی شەریعەتی کە بۆ سەردان هاتنەوە مەهاباد نایەیەکی چاکیان بۆکڕی و دەقدووی تایبەتیدا بۆیان بردەوە و پێشکەشیان کرد، زۆری پێ خوشبوو، بەڵام لە لێدان هیچی نەدەزانی، ڕۆژێکی لەبەر دەرکی مزگەوتی ئاغەڵان خەڵکێکی زۆر لێیهالابوون نایەی بۆ لێدەدان هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو. هەر فیڕە و قیڕەی لێدەهات. لەپڕ دمی لە نایەکە کردەوە و کوتی: ئەرێ چاکی لێدەدەم؟ لێکڕا کوتیان: ناوەڵلا. کوتی: چۆن؟! وەڵلا دەنا دە دڵی خۆمدا بە هەرمێ بە هەرمێی لێدەدەم...!

❖ کاسب کەمتر دەهاتە مزگەوت، ڕۆژێک مەلا لێی تووڕە بوو کە بۆ نایەیە مزگەوت و نوێژ ناکەی؟ ڕۆژێکی جومعە دوای نایە وە گیر کەوتن و تووڕە بوونی مامۆستا کاسب وە ژووری مزگەوت کەوت و دە سەفی سێهەمدا دانیشت، مامۆستا زۆری پێ خۆشبوو. بەڵام کاسب دە کاتی خوێندنەوەی خوتبەی عەرەبیدا هەر بە دەست ئیشارەی دەکرد و مامۆستا چی لێ حاڵی نەدەبوو. هەتا نوێژ تەواو بوو، مەلا بە پەلە خۆی گەیاندە کاسب و کوتی: هەتیوە کاسب ئەوە وەختی خوتبەخوێندنەوەکەم ئەو ئیشارانەت لە چیبوو؟

کاسب کوتی: ئەودەم دەمەویست پێت بڵێم بەوەی نییە سەلکی نایەم ئەوەندەیە (مستی گرێ) جەماعەتانیش دەکەم.

❖ کاک حوسێن ڕەسوولی کە مامۆستای قوتابخانەیە گێڕایەوە: لە گوندێک خەریکی دەرسی پۆلی یەکەم بووم، دەرسی فارسیم تەواو کرد و کوتم: جا منداڵەکان کتێبە فارسییەکانتان دەوێ نێنەوە، کتێبی ڕیازی دەرێنن، هەموو بە قسەیان کردم

تەنیا قوتابییەکی چلمنی تەنبەڵ مابۆوە هەروا کتێبە فارسییەکەی لە پێش بوو، ئاواڵەکەی تەنیشتنی کە لە سەر تەختێک دانیشتبوون دە کەلەکەی کوتا و کوتی: کوڕە هەتیوە ئەوە مدیرت پێ کەرە؟ مەگین نالێ ڕیازی دەرێنە؟

❖ کاک برایمی مەلا خدری شەریعەتی (سیاقۆڵ) گێڕایەوە: دەگەڵ ڕەسووڵ داودی و قادر خالیدی لە گەرۆر مامۆستای قوتابخانە بووین، پوور زێنەب خێزانی حەمەدی بەکرەی عەمری خوای کردبوو، دەگەڵ مامۆستا مەلا ئەحمەدی گەرۆرێ بۆ فاتیحاخوێنی لە ماڵی مامەڵلای دانیشتبووین. دوای هێندێک قسەکردن باس هاتە سەر ئەوەی کوتیان: مەلا و معەللیم دە بەر دەستی ژنەکانیاندا زەلیلن، بەتایبەت ئەتۆ مامۆستا خالید قادری زۆر بێدەسەلاتی، ئەویش کە بڕێک بە خۆیدا شکابۆوە کوتی: ئەوە دەڵێن چی؟ قەستەم بە خودای من و مامۆستا ڕەسوو و ماموستا برایم، قەتمان ژن پێ پیاو نەبووە.

❖ خدرەڵلای سیاقۆڵ بۆ پەیداکردنی بژیو چووبوو کوورەخانەی تەورێز، عەجەمی کەم دیبوون و فارسیشی هیچ نەدەزانی، مەشەدی حەسەن کە لەوێ کاری دەکرد بە قەراغ مەیدانی کاری مام خدردا دەڕوا زۆر بە دەنگێکی بەرز بانگ دەکا، کاکا خدر خەستە نەباشی (ماندوو نەبی) مام خدریش بە دەنگێکی نێرتر جوابی دەداتەوە، ئای سلامەت نەباشی (سلامەت نەبی) گارداشم.

❖ وەستا عەلی مەحمودی خاڵی کاک برایم شەریعەتی کوتی: ڕۆژێک لە سەربازی دە سەفی ڕێژەدا بە سەر عەجەمێکدا کەوتم، عەجەمە بەربۆوە و بەناڕەحەتی کوتی: هۆل نەدێ بابا (بابم پاڵم پێوە مەنێ)، دەگەڵ گوێم لەو قسەیە بوو وامزانی جنێو

بە بابم دەدا، بە هەموو دەمایە خۆم شەقێکم لێدا، قۆڵبەستیان کردم بۆ مەحکەمە، چرا زەدی؟ (بۆ لێت دا) وەڵلا جنێو دادی، گوفتی: هۆڵنەدی بابا، حاڵیان کردم هولدان یانی پاڵپێوەنان، هەتا کۆتایی سەربازییەکەم هەر خەجاڵەتی ئەو سەربازە بووم.

❖ حاجی مینەی مەمەنداوێ پیاوێکی زۆر لەسەرخۆ و قسەخۆش بوو، ڕۆژێک یەکێک لە کوڕەکانی دێتەوە ماڵ و دەڵێ: بابە کانی بنەوشان یەک باوشی ئاو پێدا دێ، حاجی دەڵێ: ئیشاڵلا درۆیە.

کوڕەکەی دەڵێ: بە خودای زۆر بوو بە قەد پلوسکێکی پێدا دەهات، حاجی دەڵێ: ئیشاڵلا درۆیە، قەت وانەبووە، کوتی: بە قەت شیلانگێکی گەورەی پێدا دێ، حاجی دیسان دەڵێ: ئیشاڵلا درۆیە، کوڕە دەڵێ: بە قەت شیلانگێکی چکۆلەی پێدا دێ.

حاجی هەڵدەستێتە سەر پێ و دەڵێ: حەیف کارم هەیە و دەبێ بڕۆم دەنا دادەنیشتم و هەتا تەڕاییم لێ نەبڕیبای وەدەر نەدەکەوتم.

❖ کاسبی قسەخۆش (مستەفا) خەڵکی ئاغەلانی سەردەشت وای نیشان دەدا لە عەجەموستان فێری فارسی بووە، بۆ خۆڕانان ملی قەپ دەکردەوە و لە جیاتی ئەوەی بڵێ ما اینیم دیگە (ئێمە ئەوەین ئیدی) دەیکوت: ماینیم دەگێ.

❖ ... لە گەرۆڕڕا ماڵی هاتبوو مەهاباد، چەند ڕۆژێک گوزەرا لە بەر ئەوەی فێری ژیانی لادێ بوو بەوەندە ماوەیە لە ژیانی شار جاڕز بوو لە بەرەخۆیەوە دەیکوت: تەک بە زیادم نەکردی شار، جا وەرە ئەوە دڵم دەترۆقێ، نە سەیەک دەوەڕێ، نە مانگایەک دەهوڕێنێ، نە کەرێک دەزەڕێنێ، تۆ خولا ئەوە خەڵکی شار چۆن دەژین؟!

❖ مام برایم خەڵکی مەهاباد بۆ پەیداکردنی بژیوی ژیان چووبوو کورەخانەی هەمەدان، بەڵام بەهۆی کزی و کەمتاقەتی هەمیشە نە خۆش و نێوککەوتوو بوو، دەمانپرسی مام برایم چۆنی؟ بۆ هەمیشە نێوکت کەوتووە؟ دەیکوت کاکە هەتا چاو لەو سورمەی دەکەم کە دەبێ هەمووی بە پێمەڕە بکەمە پاستاو و ئاوی تێکەم و بخووسێ و ئەو مندالانە بیکەن بە خشت، لە ترسان و لە عەیبەتان نێوکم دەکەوێ.

❖ یەکێک لە برادەران لە قۆزلوێ معەللیم بوو، دە ئاخری ساڵدا بە یەکێک لە قوتابییەکان کە زۆر تەنبەڵ دەبێ دەڵێ: کوڕە ئەوە بۆ بە بابت ناڵێی ساڵی ئەوساڵ دەعوەتێکی نەکردین! زۆر بە پەشۆکاوی دەڵێ: خۆ پێیم کوتووە دەعوەتێکت بکا، دەڵێ دەی باشە بابت دەڵێ چی؟ کوڕە دەڵێ: بابم عەرزت دەکا دەگەڵ من گووتان خوارد.

❖ کاک عەلییەک بوو لە سیاقۆڵی سەرێ مەڕدار بوو. نەهاتی ڕووی تێکرد مەڕەکانی مردن، سەگەکەی مابوو قەپەگۆڵێکی زەلام بوو پێیان دەکوت گۆڵی گورگ خنکێن، بێقەدر ما و تەواو فەرامۆش کرا، خەڵک پێیان دەکوت: کا عەلی گوناحە سەولەی لێ مەبڕە ئەوە ڕۆژگارێک خزمەتی پێکردووی.
کا عەلی دەیکوت: ئێوە نازانن من بەو کارە باریکی دەکەمەوە دەیکەمە تاجی زستان دەیبەمە ڕاوێ.

❖ عەلی نێوێک هەبوو لە ئاغەلان، پیر و لاواز بوو، دەگەڵ ڕۆژووان هیچ نێوانی نەبوو. ئەو ساڵەی دوای بیستنی مەوعیزەیەکی زۆر ڕۆژوویەکی گرت، لای ئێوارێ زۆر برسی و تینوو وشەکەت لە بەرەخۆیەوە دەیکوت: ڕۆژوو هێندەم عەزیەت مەکە، با دەردی پارت نەدەمێ، پرسیان بۆ پار چت لێکردن؟ کوتی: وەڵلا پاکم خواردن.

❖ عەلی کەڕەیەک هەبوو لە گوندی گەرۆر جار و بار قسەی زۆر سەیر و سەمەرەی دەکرد، ڕۆژێک (ساڵی ١٣٥٠) باسی قسەی حەق و ناحەق بوو، لەپڕڕا عەلیە کەڕە هەڵیدایە و کوتی: کوڕە بابم بە خودای هەرکەس بیەوێ دەو دەور و زەمانەیدا قسەی حەق بکا دەبێ بارگینێکی باش لە بەر دەرکێی وەبەستێ هەرکە قسەکەی کرد بە غار لێی سوار بێ و هەڵێ وتێی تەقێنێ دەنا باسی سەری دەبێ.

❖ قوتابییەکی سێهەمی سەرەتایی لە گوندی ئاغەڵان لە لای کاک یۆنس ڕەسووڵی دەرسی دەخوێند، دەرسیان گەیشتبوو بە تابلۆی ڕاهنوماوڕانەندەگی (مرور) کە یەکێک لە دەرسەکانی کتێبی تەعلیماتی ئیجتیماعی (کۆمەڵایەتی) بوو (ئاغەڵانیش بە عومراتی خۆی تا ئەو کات ماشێنی بە خۆیەوە نەدیبوو). کاک یۆنس دەستی لە سەر تابلۆکە دانا و کوتی: (لطفا بوق نزنید) کە ماناکەی دەبێتە (تکایە دیدە و سیگناڵی لێ مەدەن) کێ دەزانێ مانای ئەو تابلۆیە چییە؟ کوڕێک نێوی ئاوات بوو هەستا سەر پێ و کوتی: مامۆستا ئەوە یانێ توخولا لە بۆقان مەدەن.

❖ جاران هاتوچۆی شار هێندە هاسان نەبوو، ئیوابوو دەدێدا پیر دەبوو و دەمرد چاوی بە شار نەدەکەوت. سەعدوون خەڵکی سیاقۆڵ و بە درێژەی تەمەنی هەر شوان و شەو بە کێو بوو بەڵام بەردەوام دە ئارەزووی کڕینی حەلیتریک (چراقووە)دا بوو. ڕۆژێک کابرایەکی چەرچی ڕێی دە سیاقۆڵ دەکەوێ لە بەختی سەعدوون حەلیتریکیشی پێدەبێ، سەعدوون یەکەم کەس بوو ڕۆیشتە لای، هەر کە کابرا سەری سندووقەکەی هەڵگرت و سەعدوون چاوی بە حەلیتریک کەوت لە خۆشیان شاگەشکە بوو، دوور بە دوور هەرایان لێکرد: سەعدوون چی پێیە؟ سەعدوون کە بە ئارەزووی خۆی گەیبوو دە وڵامدا هەرای دەکرد و جوابی دەداوە: حەلیتریک و هەموو شتێک.

❖ سەلامی شەریعەتی لە دایکبووی سیاقۆڵ و خەڵکی مەهاباد سەعاتی نەبوو. ئەغلەب ڕۆژان ئێواران بۆی مەعلووم نەدەبوو وەخت بۆ نوێژی نیوەڕۆ ماوە یا نا؟ هەر بۆیە دە کاتی نوێژ دابەستندا بەو جۆرەی نییەت دێنا: نییەتمە چوار ڕکات نوێژی ئەو نیوەڕۆیە ئەگەر ماوە بە حازری، ئەگەر نەماوە بە قەلا و قەرز بۆ خودای تەعالا.

❖ عەولای مەولوودی خەلکی سیاقۆڵ ڕۆژێک سواری ماشێنی خەتی نێو شار دەبێ. هەتا دەگاتە مەیدانی حەیوانان بەستەیەکی پووڵ لە گیرفانی دەردێنن. ئەو شەوە لە حەیفان خەوی لێناکەوێ، بۆ ئەوەی فێڵ لە گیرفانبڕەکە بکا و دەداوی خا، وەک بەستەپووڵ کارتۆن و مقەببا و کاغەزی دەبڕێ و ئەو لاو لای بەستەکان سەتمەنییەک دادەنێ تا تەواو وەک بەستەپووڵ بچن. بەیانی بە تەمای گرتنی دزەکە دەچێتە نێو شار و لە مەیدانی حەیوانان سواری ماشێنە خەتێکە دەبێتەوە و تەواو ئاگای لە خۆی و دەور و بەری دەبێ، چونکی بە پێوە دەبێ هەر چاوەڕوانی ئەوە دەکا یەکێک دەست دە گیرفانی بنێ و ئەویش بیگرێ، لە چوارڕێی مەولەوی کابرایەکی دانیشتوو فەرمووی کاک عەولا دەکا لە جێی ئەودانیشێ، کاک عەولا بەو فەرموویە کورتەکاتێک لە خۆی خافڵ دەبێ، لە مەیدانی ئارد کە دادەبەزێ دەست بۆ گیرفانی دەبا دەبینێ ئەو نۆرەیەش لێی دزراوە.

❖ لە گەرۆر مامۆستای قوتابخانە بووم، بۆ پیاسە و گەڕان دەگەڵ هاوکارێکم چووبووینە لای قەبران، هێندێک لە منداڵانی مەدرەسەش لەو بەرە و بەری جادە کایە و تۆپێنیان دەکرد، هەر کە چاویان بە ئێمە کەوت هەموو لێکرا خۆیان حەشار دا. کابرایەکی خەلکی نێو دێ بە نێوی مەحموودی ڕەسووی وسمانی لە دار کردنێڕا دەهاتەوە و ئاگای لەو هەلات هەلاتەی منداڵان بوو، هەر کە گەیشتە ڕاستی ئێمە

کوتی: پەککو قەستەم بە خودای قەت گورگ وا لە سەی مەڕی نەترساوە، ئەو مندالانە و پاکی لەبەر هەلاتن!!

❖ خاڵ سوار لە سیاقۆلی سەریَ دەژیا، ژنی نەهێنا بوو و بە کوڕی مرد (برایەکی بوو بە نێوی عەولا گۆزەڵ بە هۆی نەخوشی عومری درێژی بۆ سوارە بە جێهێشتبوو) دایکی سوارە بە نێوی پوورگۆزەڵ حەکیمی خۆمالی بوو. دوای مردنی عەولا، سوارە و دایکی تەنیا مانەوە، کە لێیان دەپرسی خاڵ سوار لە مالی دنیا چیت هەیە؟ زۆر بە ئارامی دەیکوت: پیرەدایەک و پیرەگایەک.

❖ قەدیمی دەڵێن: دیتنەوەی ژنی نەجیب زۆر سەخت و گرانە، بەلام ژیان دەگەڵی زۆر هاسانە، بەلام دیتنەوەی ژنی جلف و نانەجیب زۆر هاسانە و ژیان دەگەڵی زۆر سەخت و گرانە.

❖ قەدیمی دەڵێن: دروست نییە سێ کەس پێکەوە هاوسەفەر بن یا بە ڕێیەکدا بڕۆن، چونکی بە تەجرەبە دیتراوە دوویان یەک دەگرن و یەکیان لە خۆیان هەڵداوێرن.

❖ عەلییاوەر ڕۆژی ٨٠/١٢/٢٩ هەرچەند بۆخۆم بیستبووم و نووسیبوومەوە دە مەجلیسێکدا بە خۆشی هاتنی نەورۆز ئەو بەسەرهاتەی دەبارەی بابمدا بۆ جەماعەتێ گێڕاوە: مام عەولا هاتوچۆی عێراقی دەکرد، جار و بار کوت و بالتۆی دینا، ڕۆژی نییەتی ڕەمەزانێ فەردەیەکی کۆتی ژنان بۆ هێنام و کوتی: بۆ بەیانی پوولەکەیم دەویَ چونکی دەگەڕێمەوە عێراق، بەیانی هاتە بەر دەرکی دووکان و دەستی دەبەر کەلەکەی نا، کوتم وەرە ژوور نەقلێکت بۆ بگێڕمەوە، هاتە ژوور، ئەو نەقلەی دەمەویست بۆم

گێڕاوە، زۆری پێخۆشبوو باسی پووڵی نەکرد و وەدمرکەوت، بـۆ بـەیانی هاتـەوە دیسـان نەقڵێکی دیکەم بۆ گێڕاوە، هەستا سەر پێ و کوتی: عەلی ئەوە ئەو ڕۆش ڕۆیشتم، وەعـد بێ هەرکات بێم و نەقڵی تازەت پێ نەبێ، دەقـەیـەک دە سـەرتەوە نـاچم و پووڵـەکەت لێدەستێنم، عەلییاوەر کوتی: چونکی هەتا مانگێک پووڵـەکەم بـۆ هەڵنەدەسووڕا و لـە تەبیعەتی مام عەولا حاڵی بووم ناچار بووم هەموو ڕۆژێ نـەقڵ و بەسـەرهاتێکی بـۆ ڕۆژی دواتر بۆ ئامادە کەم.

❖ سەید جامی سەیدنەژاد گێڕایەوە: لە سەردەشـت پیـاوێکی زۆر خراپـی لێبـوو هەتا خراپە هـەبا چاکـەی نـەدەکرد، وای لێهـات نـەخۆش کـەوت و مـەرگ بـەربینگی پێگرت، خزم و کەسی هاتنە لای مامۆستا و کوتیان: تەشـریف بێنـە قوڕعـانێکی لەسـەر بخوێنە هەرچەندی بفەرمووی دەتدەینێ ئەی بەڵکوو دەو ئاخرییدا خودا بیبەخشێ.

مامۆستا کە کابرای باش دەناسی بەو قسەیە پێکەنی و کوتی: بڕۆن بڕۆن هـەر شـەش تەلاقی ئەو ژنانەم کەوتبن لـە سـەری بخـوێنم سـەهلە ئەگـەر لـە جێـی کفـن دەسـی جزوەی قوڕعانیشێوە پێچم خودا نایـەخشێ، خۆ خراپە نەماوە نـەیکردبێ، مـن لـە خـۆڕا عەزیەت مەدەن و پووڵی خۆشتان لە خۆڕا زایە مەکەن.

❖ دارمێ یەکێک لە دێیەکانی سەردەشـتە و نزیـک سنوور هەڵـکەوتووە. پیـاوێکی قەدیمی لێدمێ نەخۆش دەکـەوێ، مـەلا و کـەیخودای ئـاوەدانی دەچـنـە سـەردانی و ئەحواڵی دەپرسن و دەڵێن ئیشتییات لە چییە؟ دەڵێ ئاخ لە ئاخی دەدنیایـە، ئێسـتا لـە هەورازی گوێزەهیجری بی، تێلەکەیەکی گرانت پێبێ، کوولێرەیـەکی جـۆ و قونچکـەکت پیواز پێبێ، دانیشی و تێر لێی بخۆی و چا بێـوە. (هـەورازی گـوێز هیجـری لـە نێـوانی نارست و بووبانەیە و هەورازێکی هەتا بڵێی ڕژد و ناخۆشە).

❖ سەید جامی سەیدنەژاد کوتی: کانی گوێز لە نزیک ڕەبەتی سەردەشت و زۆر بنیادەمی قسەخۆشی لێ هەلکەوتووە. جیرانێکمان بوو بە نێوی خاڵ حەمە پیاوێکی زۆر ساویلکە بوو. ئێمە تازە ڕادیۆیەکمان کڕیبوو، دەهات دادەنیشت و گوێی دەدایە، ئەگەر ڕادیۆ گۆرانی وەک ڕەسوولگەردی و ئەوانی دیکەی کە پێی خۆش بوون بڵاوی کردباوە خاڵە حەمە سەرێ بۆ دەلەقاند و دەیکوت: ئەی بە مەرقەدی شێخ قادری ڕادیۆن سەتهەزار تومەنی دێنێ، ئەگەریش ئەو شتەی بلاو دەبۆوە بە کەیفێی نەبایە دەیکوت: بە مەرقەدی شێخ هادی ئەڕبەیەک هەرزن ناهێنێ.

ئێمە سەماوەرمان هەبوو خاڵ حەمە زۆری پێ سەیر بوو دەیکوت: شت لەهەوەی عەلامەتتر نییە، ئاو و ئاور دە پاڵ یەکدان، پوور خانزاد دایکی خاڵ حەمە جگە لە خاڵ حەمە خدر و قادریش کوڕی بوون کوتی: ڕۆڵە ئەگەر چوونە شار لەو شتەی ماڵە سەیدی هەیانە یەکێکی بێننەوە. خدر دێتە شار و سەماوەرێکی تەنەکە بە حەوت تمەن دەکڕێ ودەیهێنێتەوە، پوور خانزاد ئەوەندە فەقیر بوو سەرەکەی لە سەر هەلناگرێ و هەر بە ئاتەشخانەکەیدا ئاو دە سەماوەرەکە دەکا و ئاو بە بنەوەدا دێتە دەر، دێتە ماڵی ئێمە و بە دایکم دەڵێ: سەیدزادێ، خدرۆکێ مە شتەکی وەکی ئی ئێوەی لە شارڕا هێناوە هەرچی ئاوی تێدەکەم تێی ناوەستێ و بە بنەوەدا دێتەوە دەر و ئاورەکێش دەکوژێنێتەوە!

دایکم کە دەچێ و ئەو حاڵە دەبینێ دەڵێ: خۆ پوور خانزاد وا نابێ، دەبێ ئەو سەرەی لابەی و ئاوەکەی دێرەکەی و ئاورەکەش دێرە، پوور خانزاد دەڵێ: ئەی دەبەر حەمرێت مرم، دەنا من ئەوەم نەدەزانی، وەللاهی بە مەرقەدی شێخ قادری نەهاتبای سێ شەو و ڕۆژی دیکە هەر ئاو و ئاورەکەم دەپاڵ یەک دەکرد، خەریک بووم بەزمێ بە خدرۆکێ بگرم، جا چا نەبوو هاتی، دەنا ئەوڕۆم بە خدریدا دەناردەوە. (بەڕاستی خەڵکی قەدیم سادە و دڵپاک بوون).

❖ لە نێوانی بانە و سەردەشت کابرایەک گوێلکێکی پێدەبێ دەیەوێ بۆ فرۆشتن بیباتە شار، لە دم جادە چاوەڕوانی هاتنی ماشێن دەبێ، لە ناکاو ماشێنێکی تویتای بێدەرکە پەیدا دەبێ و کابرا دەستی لێ هەڵدێنێ و ماشێن ڕایدەگرێ و کابرا دەڵێ:سوارمان کەی مەمنوونت دەبم، شۆفێر دەڵێ دەبینی ماشێنەکەم دەرکەی پێوە نییە، گوێلکەکەت بەردەبێتەوە، کابرا دەڵێ: قاپی پێوە نییە با پێیوە نەبێ خۆم و گوێرەکەکە ئەچینە پاشەوە، خۆم هۆشم پێوەی ئەبێ و ناهێلم داکەوێتە خوارەوە، شۆفێر دەڵێ: زۆر باشە. کابرا و گوێرەکە سواری پشتەوەی تویتا دەبن و ماشێن دەڕوا، بەڵام کابرا زۆر ماندوو دەبێ و بای فێنکی پاش ماشێن باوەشێنی دەکا خەوی لێدەکەوێ و گوێل هەوساری لە دەست بەرەڵلا دەبێ و گوێلک ئەو دەرفەتە دەقۆزێتەوە و لە ماشێن باز دەدا ئەی قاچی دەشکێ یا بۆی دەردەچێ نازانم، بەڵام دوای نیوسەعات کە کابرا لە ناکاو وە خەبەر دێ و گوێرەکەکە نابینێ بە شلەژاوی بە مست لە بانی وەتاغی شۆفێر دەدا و هەرای لێدەکا: ئا بە قوربانت بم چاوێک بە ژوورەکەتا بخشێنە بزانە گوێرەکەکە نەهاتۆتە پێشەوە؟

❖ مەلا سەید سەلام خەڵکی کۆلەسەی ناوچەی سەردەشت، لە مەلا هەرەباشەکانی کوردوستان بوو هەر فتوایەک دابای هیچ مەلایەک ڕەتی نەدەکردەوە، بەڵام هەروەک هەموو زاناکانی زەمانە مێشکی پڕ و گیرفانی بەتاڵ بوو.

ڕۆژێک دەچێتە سەر دەشت بەڵام هیچ پوولی پێنابێ، بە نێو بازاڕدا دەگەڕێ هیچی بۆ ناکڕدرێ و زۆریش برسی دەبێ. با ئەوەش بڵێین مەلا دە قەلافەتدا پیاوێکی تەواو کەلەگەت و چوارشانە بوو، چاو دەگێڕێ وەستا سمایلی پینەچی دەبینێ ئەوە سەری بەر داوەتەوە و خافڵ لە هەموو دنیایە خەریکی کاری خۆیەتی، مەلا دەچێ و لە پشت سەری ڕادەوەستێ و لە ناکاو دەڵێ: کوڕە ئەو دوو تمەنەم بۆ نادەیەوە؟

وەستا سمایل کە مەلای بە عومراتی خۆی نەدیبوو بەو تێوە خوڕینە لە ناکاوە تێک ڕادەبێ و بە شلەژاوی چاوێکی لێدەکا و بە پەلە دەست بۆ دۆشەگەڵەکەی ژێر خۆی دەبا و دەڵێ: فەرموو قوربان دوو تمەن نییە و چوار تمەنە، مەلا چوارتمەنەکە وەردەگرێ و دەچێ نان و کەبابێک دەخوا و هێندێک کەلوپەلی پێویست دەکڕی وەدەگەڕێتەوە.

بەڵام ناگاتە قاوەخانەی خالەباسی (خاڵ هەباس، هەباس شەش‌قامکیان پێدەکووت پێش ئەوەی بگەیە سەردەشت لە زەردەکەمبەرەی قاوەخانەی بوو پیاوێکی بەخولق و ماریفەت بوو، خاڵ هەباس دە ساز کردنی سەبیلەدا وەستایەکی قابیل بوو) سوارێک بە پڕتاو دەگاتە سەری و دەڵێ: مەلا سەید سەلامت نەدیوە؟ دەپرسێ مەلا سەلامت بۆ چییە؟ دەڵێ هەیهوو! تەلاقم کەوتوون دەڵێن بەوی نەبێ بە کەس چا نابێتەوە، دەڵێ: دابەزە و وەرە خوار، ئەتۆ سوار و ئەمن پیادە پێک‌ناگەین دەچینە قاوەخانەی خالەباس ئەگەر کوتیان مەلا سەلامم ئەو وەخت تەلاقەکەت بۆ چادەکەمەوە و ئەتۆ بە خێر و ئەمن بە سلامەت، کابرا تەریق دەبێتەوە، دادەبەزێ و مەلا سەید سەلامی سوار دەکا و دەچنە قاوەخانە و خاڵ هەباس بەرەو پیری مەلا سەلام دێ و حورمەتێکی زۆری لێدەگرێ، ئەو جار مەلا سەلام ڕوو دەکاتە کابرا و دەڵێ: بلێ بزانم چۆنت تەلاق خواردووە؟ کابرا دەڵێ: قوربان تەلاقم کەوتووە لە سەر ڕۆینی ناوێ، هەموو مەلا دەڵێن بە تۆ نەبێ بە کەس چا نابێتەوە، ئێستاش مامۆستا ژنەکەم زۆر خۆش دەوێ و هەتا بشلێی دەوڵەمەندم، سەت تمەنت دەدەمێ بۆم چا کەیەوە. مەلا سەر حیسابی قەرزەکانی دەبێتەوە دەبینێ هەشتا تمەن قەرزدارە، دەڵێ هەشتا تمەنم دەیە تەلاقەکەت بۆ چا دەکەمەوە هەرکەسیش پرسی کێ بۆی چا کردوویە؟ بلێ مەلا سەید سەلام، کابرا هەشتاتمەنەی دەردێنێ و دەستی مامۆستای ماچ دەکا و بە پڕتاو بەرەو واوان دەگەڕێتەوە. مامۆستاش هەشتا تمەنەکە دەگیرفانی دەنێ و دەگەڕێتەوە

سەردەشت و دەچێتە لای وەستا سمایلی پینەچی، سلاوێ دەکا، وەستا سەر هەڵدێنێ و جوابی سلاوەکەی دەداتەوە، مەلا سەلام دەڵێ:وەستا خۆ تۆ بە عومراتی خۆت منت نەدیوە و نەتناسیوم ئەو چوارتمەنەت بۆ دامێ؟ خۆ تۆ بە من قەرزدار نەبووی؟! ها ئەوە پوولەکەت، وەستا سمایل دەڵێ نامەوێتەوە هەر ئەو دەمیم گەردن ئازا کردی، مامۆستا دەڵێ: باشە چۆن بوو ئەو کات ئاوا سووک و هاسان ئەو پوولەت دامێ؟ وەستا دەڵێ: وەختایەک سەرم هەڵێنا جحەندەمت دە نێو چاوانیڕا دیار بوو، کووتم بێ و نەبێ حەزرەتی عیزڕائیلی و هاتووی رووحم بکێشی.

ئەو بە سەرهاتە کۆن بوو بەڵام حاجی لەتیفی کوڕی وەستاسمایل و منداڵەکانی بە لانی‌کەمەوە سەتجار ئەو چوارتمەنەیان لە مەلا سەیدسەلام و منداڵەکانی ستاندووەتەوە. هەر قەدەر نا قەدەرێک یەکێک لەو بنەماڵە پێشی بە یەکێک لەو بنەماڵە دەگرت و دەیکوت: بابی ئێوە چوارتمەنی لە بابی ئێمە ستاندووە یاڵلا بماندەنەوە. ئەڵبەت ئەو کارەیان بۆ شۆخی و خۆشی و پێکەنینی خۆیان کردووە (خوا رووحی ئەو قەدیمییە دڵسافانە شاد کا).

❖ دە مانگی ڕەشەمەی ۱۳۷۵دا بە هۆی شکانی لاقی شوانە (فریای کوڕم) ڕێم کەوتە نەخۆشخانە، ژنێک بە بانگ و سەلا دەگریا. لە هۆی گریانەکەیم پرسی، کوتی: چەند ڕۆژ لەمەوبەر کوڕەکەم لاقی شکا و هێنامانە نەخۆشخانە، پاش هەڵبەستنەوە و دانانی پلاتین کوتیان: حەفتاهەزار تمەن بێنە و کوڕەکەت بەرەوە، هەرچی پاڕامەوە بۆیان کەم نەکردمەوە، چووم وە خزمان کەوتم پەنجا هەزار تمەنم قەرز کرد وهێنام و کوتم: لەوەندەم زیاتر بۆ پەیدا نەبووە. کوتیان ئەگەر قڕانێکی کەم بێ کوڕەکەت نادەینەوە. هاتمە دەرێ دەستم کرد بە گریانێ، پیاوێک هات زۆر لە تۆ دڵسۆزانەتر کوتی: خوشکێ گیان بۆ دەگری؟ حاڵ و مەسەلەم بۆ گێڕاوە، زۆر ناڕەحەت بوو کوتی:

بەڕاستی بێئینسافن! جا چۆن حاڵ و وەزعی ئافرەتێکی وەک تۆ وەبەر چاو ناگرن؟ دادەی ئەو پەنجایەی پێتە بمدەیە بزانم چۆن لێت وەرناگرن و کوڕەکەت نادەنەوە؟

پەنجا هەزار تمەنەکەم دایە، پوولەکەی لێ وەرگرتم بە بیانووی چوون بۆحیسابداری لێم دوور کەوتەوە، ئێستا دەبینم بە دەرکەکەی دیکەی نەخۆشخانەدا بۆی دەرچووە، براکیان لە دەست ناپیاوەتی ئەو خەڵکە دەگریم. (دڵخۆشیم داوە و کوتم خەڵک هەموویان خراپ نین چاوەکانت بسڕەوە با بچین کوڕەکانمان بەرینەوە ماڵ).

❖ کەماڵ گولابی کوتی بابم گێڕایەوە: ماڵێکی شاسەیوانی لە قەڕمقشلاغ بوون ژن و مێرد سەیر لێک دەوەشانەوە، خەڵک پیاوەکەیان نێونابوو پۆلوو (مەبەست پۆلووی ئاور) ژنەکەشیان نێو نابوو مشکی (خۆڵەمێش)، ڕۆژێک هەواڵیان هێنا مشکی مرد، خەڵک ورد و درشتی ئاوەدانی لێی کۆ بوونەوە، یەکێک کوتی: ئاوێنەیەکی لە بەردمی ڕاگرن بزانن هەڵمێ دەکا یا نا؟ (مردووە یا نا) پۆلوو کوتی: وا مەکەن، ئەو خەڵکە تازە کۆ بوونەوە، نەشمردبێ ئاخری ڕۆژێکی هەر دەمرێ، ناوەڵلا با خەجالەتی ئەو خەڵکە نەبم بینێژن، سوێندی خوارد منداڵ بووم و هیچم لە دەست نەدەهات دە کاتی ناشتندا دیققەتم لێگرتبوو دیتم دووسێ جار لاقی جووڵاندەوە.

❖ ژنی تەنبەڵی بەغدا ناچار بوو جێ و بنی مێردەکەی بماڵێ، بە زۆری لە وەتاغ دەری کرد و ناردێ حەوش، بە پەنجەرەدا چاوی لە ژوورێ دەکرد و دەیکوت: ماشاڵلا لە کاری ئەو خودایە! تاوێک لەوەی پێش لە کوێ بووم و ئێستا لە کوێم!

❖ ڕۆژێک ژنی تەنبەڵی بەغدا زۆری لە مێردەکەی کرد تا لەو بەرە کورسییەی هەستێ و بچێ لە بەرەکەی دیکە دانیشێ تا بنی خاوێن کاتەوە، کاتێ هەستا و چوو لە

ئـەو عەیبـەی هـەیانبوو زەماوەنـدیان نـەکردبوو و ڕەبـەن مابوونـەوە، ئـاخری دەسـتی چارەنووس پێکی گەیاندن و کوڕەکە ناردیە خوازبێنی کچەکە و کوتی: بـەو مەرجـەی دە کاتی تووڕەیی و نێوان ناخۆشیدا لێم نەکەویـە نێـو و نرکـان و پـێم نەڵـێی قـۆڕ حـازرم بتهێنم، کچەش دەڵێ: بەو شـەرتەی تـۆش دەکـاتی وادا شـەلەم پـێ نەڵـێی مێـردت پێدەکەم، بەو جورە زەماوەندەکەیان سەری گرت، پاشی چەنـد سـاڵ ڕۆژێـک پیـاوەکـە ماندوو لە جووت ڕا گەڕاوە دیتی دەرکـە داخـراوە و ژنەکـەی لـە مـاڵ نییـە، ماوەیـەک مەحتەل و دەباڵ خۆیدا زۆر تووڕە بوو، دەمو کاتەیدا ژنەکـەی بـە لەنگەلـەنگ لـە کـانیڕا گەڕاوە، کابرا کە بەڵێنی دابوو قەت شەلەی پێ نەڵێ، بەرمو پـیری چـوو و بـە تـووڕەیی لاسای کردموە و کوتی: ئەو لایەت ئاوا ئەو لایەت ئاوا لە کوێ ڕا دێیەوە؟ ژنـەش کـوتی: ئەو لایەت ئەوەندە و ئەو لایەت ئەوەندە ئەوەلەکانی ڕادێمەوە.

❖ حاجی شێخە، یەکە دەولەمەندی سەردەشت بوو دوو سـاڵ بـوو پوولـێکی بـە قەرز دابوو بە کوێخا عەولا، بەلام کوێخا گوێی خۆی لـێ ئـاخنیبوو و نەیـدەداوە، ئـاخری دەڵێ: حاجی شێخە هێندەی پێناوێ ملکێکم هەیە جـارێ بـە پوولـێک دەیقەبلـێنین ئەوت دەدەمێ ئەگەر قەرزەکە باقی مـاوە تـۆزێکم لـێ ڕاوەسـتە، دەڵـێ ملـکەکەت لـە کوێیە؟ دەڵێ: بەردەسووری پێدەڵێن. پاش ماوەیەک حـاجی شـێخە دەبینـێ کـڵاوی چۆتە سەر و بەردەسوور جێگایەکی کەس‌نەکێل و بەردەڕەقانە و بە کـاری هـیچ شـتێک نایە، حاجی شێخە ناچار دەبێ بە دوایدا دەچێتە بێژوێ ئەو وەختە شێخ مەلا محەممـەد بابی شێخ ڕەئووف نەخشبەندی لەوێ دەبێ، بـۆ شـکایەت دەچێتـە لای ئـەو و دەڵـێ: قوربان لە دەست کوێخا عەولا پەنام بۆ تۆ هێنـاوە، چەنـد سـاڵە پوولـێکم پـێ قـەرزدارە بەلام هەر ڕۆژەی بە بیانوویەک تەفرەم دەدا و نامداتەوە دەبێ بـۆم لـێ بسـتێنێوە، مـەلا محەممەد بە دوای کوێخا عەولادا دەنێرێ و دەڵێ: برا کوێخا عەولا ئـەو ڕەفتـارە چییـە

وەستا سمایل کە مەلای بە عومراتی خۆی نەدیبوو بەو تێوە خورینە لە ناکاوە تێک‌ڕادەبێ و بە شلەژاوی چاوێکی لێدەکا و بە پەلە دەست بۆ دۆشەگەڵەکەی ژێر خۆی دەبا و دەڵێ: فەرموو قوربان دوو تمەن نییە و چوار تمەنە، مەلا چوارتمەنەکە وەردەگرێ و دەچێ نان و کەبابێک دەخوا و هێندێک کەل‌وپەلی پێویست دەکڕی وەدەگەڕێتەوە.

بەڵام ناگاتە قاوەخانەی خالەباسی (خاڵ هەباس، هەباس شەش‌قامکیان پێدەکووت پێش ئەوەی بگەیە سەردەشت لە زەردەکەمبەرەی قاوەخانەی بوو پیاوێکی بەخولق و ماریفەت بوو، خاڵ هەباس دە ساز کردنی سەبیلەدا وەستایەکی قابیل بوو) سوارێک بە پڕتاو دەگاتە سەری و دەڵێ: مەلا سەید سەلامت نەدیوە؟ دەپرسێ مەلا سەلامت بۆ چییە؟ دەڵێ هەیهوو! تەلاقم کەوتوون دەڵێن بەوی نەبێ بە کەس چا نابێتەوە، دەڵێ: دابەزە و وەرە خوار، ئەتۆ سوار و ئەمن پیادە پێک‌ناگەین دەچینە قاوەخانەی خالەباس ئەگەر کوتیان مەلا سەلامم ئەو وەخت تەلاقەکەت بۆ چادەکەمەوە و ئەتۆ بە خێر و ئەمن بە سلامەت، کابرا تەریق دەبێتەوە، دادەبەزێ و مەلا سەید سەلامی سوار دەکا و دەچنە قاوەخانە و خاڵ هەباس بەرەو پیری مەلا سەلام دێ و حورمەتێکی زۆری لێدەگرێ، ئەو جار مەلا سەلام ڕوو دەکاتە کابرا و دەڵێ: بڵێ بزانم چۆنت تەلاق خواردووە؟ کابرا دەڵێ: قوربان تەلاقم کەوتووە لە سەر ڕۆینی ناوێ، هەموو مەلا دەڵێن بە تۆ نەبێ بە کەس چا نابێتەوە، ئێستاش مامۆستا ژنەکەم زۆر خۆش دەوێ و هەتا بشلێی دەولەمەندم، سەت تمەنت دەدەمێ بۆم چا کەیەوە. مەلا سەر حیسابی قەرزەکانی دەبێتەوە دەبینێ هەشتا تمەن قەرزدارە، دەڵێ هەشتا تمەنم دەیە تەلاقەکەت بۆ چا دەکەمەوە هەرکەسیش پرسی کێ بۆی چا کردوویە؟ بڵێ مەلا سەید سەلام، کابرا هەشتاتمەنەی دەردێنێ و دەستی مامۆستای ماچ دەکا و بە پڕتاو بەرەو واوان دەگەڕێتەوە. مامۆستاش هەشتا تمەنەکە دەگیرفانی دەنێ و دەگەڕێتەوە

سەردەشت و دەچێتە لای وەستا سمایلی پینەچی، سلاوێ دەکا، وەستا سەر هەلـدێنێ و جوابی سلاوەکەی دەداتەوە، مەلا سەلام دەلێ:وەستا خۆ تۆ بە عـومراتی خـۆت منـت نەدیوە و نەتناسیوم ئەو چوارتمەنەت بۆ دامێ؟ خۆ تۆ بە من قەرزدار نـەبووی؟! هـا ئـەوە پوولەکەت، وەستا سمایل دەلێ نامەوێتەوە هەر ئەو دەمیم گەردن ئازا کـردی، مامۆسـتا دەلێ: باشە چۆن بوو ئەو کات ئاوا سووک و هاسان ئەو پوولـەت دامـێ؟ وەسـتا دەلـێ: وەختایەک سەرم هەلێنا جحەندەمت دە نێـو چـاوانیڕا دیـار بـوو، کـووتم بـێ و نـەبێ حەزرەتی عیزڕائیلی و هاتووی ڕووحم بکێشی.

ئەو بە سەرهاتە کۆن بوو بەلام حاجی لەتیفی کوڕی وەسـتاسمایل و مندالـەکانی بـە لانی‌کەمـەوە سـەتجـار ئـەو چوارتمەنـەیان لـە مـەلا سەیدسـەلام و مندالـەکانی ستاندووەتەوە. هەر قەدەر نا قـەدەرێک یـەکێک لـەو بنەمالـە پێشـی بـە یـەکێک لـەو بنەماڵە دەگـرت و دەیکـوت: بـابی ئێـوە چوارتمـەنی لـە بـابی ئێمـە سـتاندووە یالـلا بماندەنەوە. ئەلبەت ئەو کارەیان بۆ شۆخی و خۆشی و پێکەنینی خۆیـان کـردووە (خـوا ڕووحی ئەو قەدیمییە دلسافانە شاد کا).

❖ دە مانگی ڕەشەمەی ١٣٧٥دا بە هۆی شکانی لاقی شوانە (فریـای کـوڕم) ڕێم کەوتە نەخۆشخانە، ژنێک بە بانگ و سەلا دەگریا. لە هـۆی گریانەکـەیم پرسـی، کـوتی: چەند ڕۆژ لەمەوبەر کوڕەکەم لاقی شکا و هێنامانـە نەخۆشـخانە، پـاش هەلبەسـتنەوە و دانانی پلاتین کوتیان: حەفتاهەزار تمەن بێنـە و کوڕەکـەت بـەرەوە، هـەرچی پاڕامـەوە بۆیان کەم نەکردمەوە، چووم وە خزمان کەوتم پەنجا هەزار تمـەنم قـەرز کـرد وهێنـام و کوتم: لەوەندەم زیاتر بـۆ پەیـدا نـەبووە. کوتیـان ئەگـەر قـرانێکی کـەم بـێ کوڕەکـەت نادەینەوە. هاتمە دەرێ دەستم کرد بە گریانـێ، پیاوێـک هـات زۆر لـە تـۆ دلسـۆزانەتر کوتی: خوشکێ گیان بۆ دەگری؟ حال و مەسەلەم بۆ گێڕاوە، زۆر ناڕەحـەت بـوو کـوتی:

بەڕاستی بێئینسافن! جا چۆن حاڵ و وەزعی ئافرەتێکی وەک تۆ وەبەر چاو ناگرن؟ دادەی ئەو پەنجایەی پێتە بمدەیە بزانم چۆن لێت وەرناگرن و کوڕەکەت نادەنەوە؟

پەنجا هەزار تمەنەکەم دایە، پوولەکەی لێ وەرگرتم بە بیانووی چوون بۆحیسابداری لێم دوور کەوتەوە، ئێستا دەبینم بە دەرکەکەی دیکەی نەخۆشخانەدا بۆی دەرچووە، براگیان لە دەست ناپیاوەتی ئەو خەڵکە دەگریم. (دڵخۆشیم داوە و کوتم خەڵک هەموویان خراپ نین چاوەکانت بسڕەوە با بچین کوڕەکانمان بەرینەوە ماڵ).

❖ کەماڵ گولابی کوتی بابم گێڕایەوە: ماڵێکی شاسەیوانی لە قەڕەقشلاغ بوون ژن و مێرد سەیر لێک دەوەشانەوە، خەڵک پیاوەکەیان نێونابوو پۆلوو (مەبەست پۆلووی ئاور) ژنەکەشیان نیو نابوو مشکی (خۆڵەمێش)، ڕۆژێک هەواڵیان هێنا مشکی مرد، خەڵک ورد و درشتی ئاوەدانی لێی کۆ بوونەوە، یەکێک کوتی: ئاوێنەیەکی لە بەردمی ڕاگرن بزانن هەڵمێ دەکا یا نا؟ (مردووە یا نا) پۆلوو کوتی: وا مەکەن، ئەو خەڵکە تازە کۆ بوونەوە، نەشمردبێ ئاخری ڕۆژێکی هەر دەمرێ، ناوەڵلا با خەجاڵەتی ئەو خەڵکە نەبم بینێژن، سوێندی خوارد منداڵ بووم و هیچم لە دەست نەدەهات دە کاتی ناشتندا دیققەتم لێگرتبوو دیتم دووسێ جار لاقی جووڵاندەوە.

❖ ژنی تەنبەڵی بەغدا ناچار بوو جێ و بنی مێردەکەی بماڵێ، بە زۆری لە وەتاغ دەری کرد و ناردێ حەوش، بە پەنجەرەدا چاوی لە ژوورێ دەکرد و دەیکوت: ماشاڵلا لە کاری ئەو خودایە! تاوێک لەوەی پێش لە کوێ بووم و ئێستا لە کوێم!

❖ ڕۆژێک ژنی تەنبەڵی بەغدا زۆری لە مێردەکەی کرد تا لەو بەرە کورسییەی هەستێ و بچێ لە بەرەکەی دیکە دانیشێ تا بنی خاوێن کاتەوە، کاتێ هەستا و چوو لە

بەرەکەی دیکە دانیشت پڕبەدڵ ئاخێکی هەڵکێشا و کوتی: ئای لە غەریبی!

❖ کوڕێک لە غەریبایەتی کەرێکی وە گیر دەکەوێ سواری دەبێ و عەکسێک (وێنە) دەکێشێ و بە پۆستدا بۆ دایکی دەنێرێتەوە. بەڵام لە پشتی وێنەکە دەنووسێ دایەگیان ئەوی سەرەوەیان منم.

❖ لە ئاوایی... کابرایەکی لێبوو پێیان دەکوت ئەحمەد گوێ خوار پێنج منداڵی سەر و پێچکەی بوو، لە ناکاو هەرا هەستا کە شەوی ڕابردوو ژنی ئەحمەد گوێ خواری ڕەدوو کەوتووە، هەر لەو ئاواییە ژنێکی بەمێردی لێبوو خاتوو مریەم ئەویش پێنج منداڵی هەبوو، پاشی چەند مانگان هەرا هەستا کە خاتوو مریەم ڕە دووی ئەحمەد گوێ خواری کەوتووە، ژن و ژاڵی ئاوایی چوونە کن خاتوومریەم و کوتیان: ماڵ کاول ئاخر چۆن دڵت هات مێردەکەت هیچ، ئەو پێنج منداڵەی خۆت ئاوارەکەی و ڕەدووی ئەحمەد گوێ خواری کەوی! خاتوو مریەم دە وڵامدا دەڵێ: بە خودای خوشکینە نابێ لێم بە عەیب بگرن، منداڵەکانی ئەحمەد گوێ خوارم هێندە پێ فەقیر بوون هەرچەند جاری بە بێ دایکیم دەدیتن کزەم لە جەرگی دەهات. (ئەوەیە کە دەڵێن بۆ منداڵی خەڵک دایک و بۆ منداڵی خۆی زڕدایکە).

❖ دوو برا ژنیان نەهێنابوو، ڕۆژێک برا چکۆلە ڕووی دە بابی کرد و کوتی: بابە گیان دەزانم دەستەنگی و ناتوانی یەکجارەکی بۆ هەردووکمان ژن بێنی، جا کەوایە پەلەت لێ ناکەین ئەو ساڵ ژنێ بۆ یەکمان بێنە و ساڵێکیدیکەش بۆ کاکم.

❖ دە دێیەکدا پیرەکوڕێکی قۆڕ و قەیرەکچێکی شەلی تێدابوو هەردووکیان لەبەر

ئەو عەیبەی هەیانبوو زەماوەندیان نەکردبوو و ڕەبەن مابوونەوە، ئاخری دەستی چارەنووس پێکی گەیاندن و کوڕەکە ناردیە خوازبێنی کچەکە و کوتی: بەو مەرجەی دە کاتی تووڕەیی و نێوان ناخۆشیدا لێم نەکەویە نێو و نرکان و پێم نەڵێی قۆڕ حازرم بتهێنم، کچەش دەڵێ: بەو شەرتەی تۆش دەکاتی وادا شەلەم پێ نەڵێی مێردت پێدەکەم، بەو جورە زەماوەندەکەیان سەری گرت، پاشی چەند ساڵ ڕۆژێک پیاوەکە ماندوو لە جووت ڕا گەڕاوە دیتی دەرکە داخراوە و ژنەکەی لە ماڵ نییە، ماوەیەک مەحتەل و دەباڵ خۆیدا زۆر تووڕە بوو، دەو کاتەیدا ژنەکەی بە لەنگەلەنگ لە کانیڕا گەڕاوە، کابرا کە بەڵێنی دابوو قەت شەلەی پێ نەڵێ، بەرەو پیری چوو و بە تووڕەیی لاسای کردەوە و کوتی: ئەو لایەت ئاوا ئەو لایەت ئاوا لە کوێ ڕا دییەوە؟ ژنەش کوتی: ئەو لایەت ئەوەندە و ئەو لایەت ئەوەندە ئەوەلەکانی ڕادێمەوە.

❖ حاجی شێخە، یەکە دەولەمەندی سەردەشت بوو دوو ساڵ بوو پوولێکی بە قەرز دابوو بە کوێخا عەولا، بەلام کوێخا گوێی خۆی لێ ئاخنیبوو و نەیدەداوە، ئاخری دەڵێ: حاجی شێخە هێندەی پێناوێ ملکێکم هەیە جارێ بە پوولێک دەیقەبلێنین ئەوت دەدەمێ ئەگەر قەرزەکە باقی ماوە تۆزێکم لێ ڕاوەستە، دەلێ ملکەکەت لە کوێیە؟ دەڵێ: بەردەسووری پێدەڵێن. پاش ماوەیەک حاجی شێخە دەبینێ کلاوی چۆتە سەر و بەردەسوور جێگایەکی کەسنەکێل و بەردەڕەقانە و بە کاری هیچ شتێک نایە، حاجی شێخە ناچار دەبێ بە دوایدا دەچێتە بێزوێ ئەو وەختە شێخ مەلا محەممەد بابی شێخ ڕەئووف نەخشبەندی لەوێ دەبێ، بۆ شکایەت دەچێتە لای ئەو و دەڵێ: قوربان لە دەست کوێخا عەولا پەنام بۆ تۆ هێناوە، چەند ساڵە پوولێکم پێ قەرزدارە بەلام هەر ڕۆژەی بە بیانوویەک تەفرەم دەدا و نامداتەوە دەبێ بۆم لێ بستێنیەوە، مەلا محەممەد بە دوای کوێخا عەولادا دەنێرێ و دەڵێ: برا کوێخا عەولا ئەو ڕەفتارە چییە

دەگەڵ خاڵەشێخە دەیکەی؟ بۆ نایدەیەوە؟

کوێخا عەولا دەڵێ: قوربان عەرزت کەم. حاجی شێخە کە ئەوەی دەبیسێ، دەزانێ کە کوێخا عەولا پیاوێکی زماندارە، بە پڕتاو دەڵێ: نا نا قوربان با عەرزت نەکا، هەر بێت و زمانی بکاتەوە ئەمن کوێخا عەولای دەناسم، بە سەری تۆ قەرزەکەم سەهلە ناداتەوە بەڵکوو شتێکیشم قەرزدار دەکا.

❖ یادی بەخێر و ڕووحی شاد بێ خالید دڵجەوان کوتی: شەوێک بۆ ئیسراحەت لە قەراغ چۆم دانیشتبووم و گوێم لە قیرەی بۆقان هەڵخستبوو. ئەوەندەیان لێ حاڵی بووم، بۆقێک دەیکوت: ئەی مرد، ئەی مرد. ئەوی دیکە دەیکوت: کێ مرد؟ کێ مرد؟ دە وڵامدا دەیکوت: پیرۆت، پیرۆت.

پرسی: بۆ مرد؟ بۆ مرد؟ دە وڵامدا دەیکوت: قۆخەی بوو، قۆخەی بوو.

❖ ئەحمەد خەلیلی دەیکوت: وەختایەک بۆقێک چاوی بە مار دەکەوێ، دەڵێ: موارموار! بۆقی دووهەم دەڵێ: کووا؟ کووا؟ بۆقی سێهەم دەڵێ: ئەوەتا، ئەوەتا.

❖ ڕەسوو مەمۆ کوتی: دۆم بە دانیشتنێ ماڵی وێرانە، گاوان تا بنوێ گاڕانی لێ دوورتر دەبێتەوە، پیاو ڕەفیقی دۆم بێ دەبێ بۆنی سیرمەشی پێخۆش بێ، ئەگەر بۆ خۆم نەمبوو دە گیرفانی ... ڕیم.

❖ ساڵان منداڵانی هەورامان و دەور و بەری پاوە ئەگەر لە جۆگەیەکی گەورە بازدیان دابا یا شتێکی قورسیان دەست دابایە دەیانکوت: ناوکەی خۆم نەکەوێ، ناوکەی گوێرە سوورەی باوام بکەوێ.

❖ کوڕە کەچەڵە بەزمی بە دایکی گرت بۆی بچێتە خوازبێنی کچی حاکم، کاتێ حاکم ئەوەی زانی دەستووری دا کەچەڵی دە فەڕاشخانەی کەن و ئاوی ساردی دەپاڵ کەن، چەند شەو سەرما لە قەبرغەی کەچەڵی دا، هێنایانەوە بارەگا و پرسیان: بڵێ بزانین دایکت بە دوای چیدا ناردووە؟ کەچەڵ کوتی: قوربان خەونێکە دیتوومە دەبێ لێم ببوورن.

حاکم دەستووری دا دە فەلاقەی کەن و تێی هەڵدەن، کەچەڵیان لە دار و فەلاقە بەست و بە شولکان دایانگرت، کاتێ تەواو کوتایان و نیوەگیانیان کرد، کوتیان بڵێ بزانین چ خەونێکت دیوە؟

کەچەڵ هاواری کرد: بۆ خاتری خوا دەس ڕاگرن لە سەرمای فەڕاشخانە و لە زەبری دار و فەلاقەی حاکم هەر خەونێکی دیتوومە لە هۆشم چۆتەوە.

❖ قەدیمییان لە بەر دەسکورتی و نەداری خۆیان بۆ ئەوەی منداڵ زیادەڕۆیی دە خواردنی پێخۆردا نەکەن و بەشی زستانەکەیان بکا، بە منداڵەکانیان دەکوت، پەنیر کوتوویە: کەمم تێبکە و وردم بجاوە / تام و لەززەتم ئەوا لە دواوە.

❖ ساڵێک سوڵتانی وڵات دەگەڵ وەزیرەکەی بە پەنا بێستانێکدا تێدەپەڕن، سوڵتان ڕوو دە وەزیر دەکا و دەپرسێ چ خۆشە؟ وەزیر دەڵێ: خەیار.

پاشی دوو ساڵ سوڵتان و وەزیر کە بەو شوێنەدا ڕادەبرنەوە، سوڵتان بۆ ئەوەی هوشی وەزیرەکەی تاقی کاتەوە ڕووی تێدەکا و دەپرسێ بە چی؟ وەزیر دەسبەجێ دەڵێ بە خوێ.

❖ ئێوارەیەک سوڵتان مەحموود و هەیاسی خاس لە دێیەک لادەدەنە ماڵی

پیرێژنێک، پیرێژن کە نازانێ ئەو میوانانەی یەکیان سولتان و ئەوی دیکەیان هەیاسە هەروەک میوانانی نەناسیاو زۆر بە گەرمی بەخێریان دێنێ و میوانداریيەکی باشیان لێدەکا. درەنگان ئەو کە تاقە مانگایەکی دەبێ دەیهێنێ لەبەر چاوی وان دەیدۆشێ گۆزەیەکی شیر تێدا دەبێ.

سولتان مەحموود کە ئەوە دەبینێ ڕوو دە هەیاس دەکا و دەڵێ: من ئەوەم نەدەزانی، وا دیارە عایداتی مانگا زۆرە، ئێمە دەبێ کە گەڕاینەوە سەرانە و مالیاتی تایبەت بۆ مانگاکان دیاری کەین، ئەو شەوە دەنوون و بەیانی کە هەڵدەستن پیرێژن سەرلەنوێ دەست بە دۆشینی مانگاکەی دەکاتەوە بەڵام ئەو نۆرەی تەنیا پڕی جامێکی چکۆلەی شیر تێدا دەبێ، هەیاس و سولتان بە سەرسووڕماوی دەپرسن دایەپیرە ئەو مانگایە هەرهەمان مانگاکەی دوێنێ ئێوارەیە، ئەی بۆ دوێنێ ئەو هەموو شیرەی تێدا بوو کەچی ئێستا ئەوەندوکەی تێدایە؟ پیرێژن دەڵێ: ئەمشەو سولتانی وڵات ڕاونەزەری بەرامبەر بە خەلک و میللەتەکەی گۆڕاوە، سولتان کە ئەوەی بیست لە قسەی خۆی پەشیمان بۆوە.

❖ کچێک لە تەمەنی تێپەڕیبوو مێردی نەکردبوو و دە ماڵی بابیدا مابۆوە، لێیان پرسی بۆچی مێردی ناکەی؟ کوتی: جا بە ناشوکری نەبێ مێردی چی! دمو دێیەدا خوازبێنی‌کەر و ژن‌هێن تەنیا خەلیلە کوێر و جەیلیلە قوڕن، دەی ئەمن دەبەروو مرم چۆناوچۆن مێردی بکەم؟

❖ کابرایەکی ترسەنۆک ناوی کوڕەکەی نابوو ڕۆستەم بەڵام هەرچی دەیکرد زاتی نەبوو قاوی لێکا.

❖ قەدیمی دەڵێن: بەختەوەری وەک پەپوولە وایە. ئەگەر وە دوای کەوی لە بەرت هەڵدێ بەلام ئەگەر ئارام و هێدی و لەسەرخۆ بی، بۆخۆی دێ و لە سەر شانت دەنیشێ. (بۆ تەنبەلان قسەی چاکە)

❖ خالەحەمە دە عەسلدا خەڵکی بانێ بوو. کابرایەکی فەقیر و بێکەس و گاوانی دێ بوو. لە سەروەتی دنیا تەنیا کەرێکی بوو دەگەڵ خۆی دەیبردە گارانێ، لە بەیانیڕا هەتا ئێوارێ بۆ سووتەمەنی خۆی چیلکە و چرپی و چاڵ و هەرچی تووشی بووبایە کۆی دەکردەوە و لێکی دەبەست و لە کۆڵی خۆی دەنا و سواری کەرەکەی دەبوو، دەیانکوت: خاڵ حەمە بۆ ئەم بارەت لە کۆڵی خۆت بەستووە و لە کەرەکەت نەناوە؟ دەیکوت: کەرەکەم ئاوسە، دڵم نایە باری لێ قورس کەم، با بەر نەهاوی!

❖ دوو کەس هەر لە منداڵیڕا پێکەوە ڕەفیق و ئاواڵ بوون. کە گەورە بوون ژنیان هێنا و زەماوەندیان کرد و پاشی چەند ساڵ یەکیان بوو بە خاوەنی چەند منداڵ بەلام ئەوی دیکەیان هەروا وەجاخ کوێر ماوە و سریوەی منداڵی لە ماڵی نەهات، بەلام ئەو دوو کەسە هەروا وەک سالانی پێشوو هاموشۆیان بوو و هەرچەند جاری ئەو ڕەفیقە بە ژن و منداڵەوە دەهات و میوانی ئەویدیکە دەبوو. ژنی ڕەفیقەکەی دەمیوانداریدا هۆی دەداوە، کامە خۆراکی بە تام و لەزەت بوو لێی دەنا و دە لێفە و دۆشەکی مەخمەر و کەس تێدا نەخەوتوودا دەینواندن و بەکورتی دەبەر پێی خۆی و ژن منداڵەکانیدا دەبوو بە تنۆکە ئاوێک. بەلام پاشی چەند ساڵ شەوێک ئەم قسەیە لە زاری ڕەفیقەکەی هەڵخلیسکا و ڕووی دە خانەخوێی کرد و کوتی: براڵە ئاوا نابێ، زۆر حەیفە تۆ بەو هەموو پیاوەتییەتەوە وەجاغ‌کوێر و بێ‌منداڵ بی، بە قسەی من دەکەی ژنێکی دیکە بێنە با ئێمەش چاومان بە دیداری برازاکانمان ڕوون بێتەوە، خانەخوێ کوتی: ئەو کات ئەم

ژنەیەم چ لێبکەم؟ کوتی: جا چی لێدەکەی؟ ئەگەر دانیشت ئەوە باشە دەنا با بچێتەوە بۆ مالی بابی، مالی قەلب سەرووەخاوەنییەتی.

ژنی خانەخوێ ئەم قسانەی بیست و دلی بە جارێک لە ڕەفیقی مێردەکەی و مال و مندالی ڕەش بوو و بۆ ئەوەی جوابی کا و جارێکی دیکە ڕوو دمو مالە نەکاتەوە و میوانیان نەبێتەوە، وەختی شام لە جیاتی ئەوەی وەک جاران پلاو و گۆشتی بۆ لێنێت، ماشی بۆ لێنا و کاتی خەوتن لە جیاتی دۆشەگە نەرمەکەی جاران کۆنە پەتوویەکی شڕ و دڕاوی بۆ ڕاخست و لە جیاتی سەنیرە پەڕقوویەکەی جاران سیپالێکی دە پەڕۆیەکەوە پێچا و وەک گاشەبەردێک دەبن سەری نا. میوان ئەو شەوەی بە سالێک ڕابوارد و بەیانی زوو ساز بوو بەرمو مالی خۆی بچێتەوە، ڕەفیقەکەی پێشی پێگرت و کوتی: پەلەی چیتە؟ جارێ بمێنەوە

میوان دە ولامدا کوتی: نا کاکە گیان من شەو لە ڕووی نەزانییەوە قسەیەکم لە زاری هەلخلیسکا و بەو تاقە قسەیە، پلاوم لێبوو بە ماش،نوێنم کەوتە نێو دۆلاش، سەنیرم بوو بە بەرداش.

ئامان نەکەی بە قسەم بکەی، من بە کردنی ئەو قسەیە ئاوام بە سەر هات؛ بێت و بە قسەم بکەی بۆ هەتاهەتایە بێچارە و مالوێران دەبی.

❖ دەگەل دەستەیەک دوست و ڕەفیق دانیشتبووین و باسی نارەسەنایەتی ژومارەیەک کەسی نانەجیبی تازە بەسەردا کەوتوومان دەکرد، عەلی ڕەحمانزادە هەلیدایە و کوتی: تۆلکە جۆرە گیایەکە کە ئەگەر لە خۆشترین و سازگارترین کوێستان بیچێنی حەجمانی نابێ و لەو شوێنە نامێنێتەوە و هەرچۆنێ بۆی بکرێ ڕیشەی خوی دەگەیێنێتە شوێنێک کە پیسایی لێبێ.

❖ کابرایەکی دەسکورت و دلساف کەرەکەی لە پاڵ کێوێک لە برسان وەستا بوو، دەستی بۆ پاڕانە هەڵێنا و کوتی: خوایە ئەو کێوەی بە کا کەی، لە پێش کەرەشینی بە با کەی، دەتوانی بەڵام دەزانم نایکەی.

❖ بەڕەحمەت بێ مەلا محەممەد نەجمەبی مەلای گوندی خەتایی بوو، کاتی مەوعیزە بەو جۆرە ڕووی دەکردە فەقیرەکان و دەیکوت: براله خەلکینە ئینسافتان بێ، هێندە ئەو بەیار و دمجۆیانە مەکێڵن، ئاخر ئەو مەڕ و مالاتەی خەڵک پێویستییان بە لەوەڕگەیە، ئێوە خۆ جێیەکتان بۆ لەوەڕاندنی مەڕ و مالاتی نەهێشتووەتەوە، بەو قسانە فەقیرەکان سەری خەجالەتییان بەردەداوە و مەڕدارەکان ملیان قەپ دەکردو وە بالسیان بۆ دەکێشا و دەیانکوت: ئەشەدووبیللا مەوعیزە ئاوا دەبێ، پاشان دەیکوت: بەڵام ئەوانەی مەڕ و مالاتیان هەیە، ئەو مەڕ و مالاتانە تەنیا هی ئێوە نییە. ئێوە دابڕزن، زەکاتی خۆتان بۆ بە دروست و حیسابی نادەن و ئاگاتان لە فەقیرەکان نییە؟ مەگین نازانن ئەو مەڕ و مالاتەی ئێوە بەشی ئەوانیشی تێدایە؟ ئەو جار بەو قسانە فەقیرەکان ملیان قەپ دەکردەوە و بزەیان دەهاتێ و مەڕدارەکان سەریان بەردەداوە و دەیانبۆلاند.

❖ کابرایەک لە ژنەکەی لە بیانوو بوو دەیەویست تەلاقی دات. کوتی: بڕۆ دەرێ چاو لە عاسمانێ کە بزانە هەورە یا ساوە؟ جا چ هەور بێ و چ ساو بێ تەلاقت دەدەم، ژنە ڕۆیشتە دەر و گەڕاوە ژوور کوتی: نە هەورە، نە ساوە، بە حوکمی خوای ڕاوەستاوە، لەعنەت لەو پیاوەی بە ناحەق ژنی تەلاق داوە.

❖ لە گایان پرسی بۆ وا زوو پیر بووی؟ کوتی لە داخی کەر. پرسیان چۆن؟ کوتی: جووت ئەمن دەیکەم، مالوو بە منی دەکەن، جەنجەڕ و گێرەی بە من

دادەبەستن، هەرچی کار و زەحمەتە لـە سـەر شـانی منـە، کـاتی خـەرمان هەڵـگرتنێ دەوکاتەیدا کە دەگێرەی دام دەبینێکم دەزاری دەکەن کە نەکا قەپاڵێک لە کوێزر و کـا و کۆتی داگرم، کەچی کەر لە قەراغ جێخونێ بێ ئەوەی هیچ کارێکی کردبێ ئاغائاغـا بـە کەیفی خۆی دەلەوەڕێ.

❖ بابم گێڕایەوە: لە نەبیاوای نزیـک مووسـالان پیـاوێکی زۆر فـەقیری لێبـوو لـە دارایی دنیا تاقەکەرێکی بوو، مانگێک بوو بە تەما بوو پوولێکی وە گیر کەوێ کـەرەکـەی بەرێتە گەرۆر و نالی کا. ئەو ڕۆژەی کـە پوولـەکەی بـۆ هەڵـسووڕا کەرەکـەی وە پـێش خۆی دا تا گەیشتە سەر پردی قەڵاتاسییان. کەر لەسەر پردێ سەر سمێکـی دا و لـەوێ ڕا دە چۆمی زێیە کەوت و ئاو بـردی و خنکـا، کـابرا تـۆزێکی چـاو لێکـرد و سـەری بـۆ ئاسمان هەڵبڕی، پاشان دە باغەڵی گەڕا دوو قرانی دەرێنا و لەوێ ڕا دە چۆمی هاویشـت و کوتی: ها ئەوەش حەقی نالەکانی.

❖ دە دەورانی حوکمەتی قاجاردا لە ئێـران بـەرتیل و ڕیشـوەخواردن گەیشـتبوو ڕادەیەک کە هیچ کاربەدەستێکی دەوڵەت ئامادە نەبوو بێ بەرتیل وەرگرتن بچـووکترین کار بۆ کەسێک ئەنجام دات، دە زەمانی فەتحەلیشادا کە بۆ ماوەیەک قاتی و قـڕی ڕووی دە وڵات کرد، وەزیر موختاری ئینگلیس فەردەیەک پەتاتـە (یارەڵماسـی، سـێوەزەمینە) بۆ دەوڵەتی ئێران دەنێرێ و دەڵێ: ئەگەر ئێرانییان ئەو گیایە دە ئێراندا بڕوێنن، بەهـۆی ئەوەی کە نیشاستەی زۆرە هەرگیز دووچـاری برسـییەتی نایـەن. ئـەو گیایـە ڕوانـدن و ڕەعەمەڵهێنانی هاسان و بەر و بووی زۆرە و دە ناعیلاجیـدا جێگـەی نـان دەگرێتـەوە. بەڵام سەدری ئەعزەمی ئێران بەرلەوەی پەتاتەکە وەرگرێ دەڵێ: باشە، بەڵام ئەگەر مـن ئەو شتەیە وەرگرم و کارێکی وا بکەم کە ئێرانییان ئەو گیایە بڕوێنن ئێوە دە بەرامبـەر بـە

ئەنجامگەیاندنی ئەو ویستەتاندا چی و چەندم دەدەنێ؟!

❖ لە نێو ئەو گولانەیدا کـە لـە دەور و بـەری مـەهاباد جـێگیر بـوون یـەکێکیان کوڕەکەی مامۆستای قوتابخانەیە، ئەو گولـەش هـەروەک گولـەکانی دیکـە لـە کۆمـەڵ دابڕاوە بەڵام هەموو حەوتووان کوڕەکەی دەچێتە سەردانی، بابی دەباتە حەمام و پـاک و خاوێن دەیشوا و ئەرکی باب و فەرزەندیتی بەجێدێنێ.

ڕۆژێک بابە بە کوڕەکەی دەڵێ: ڕۆڵەگیان وازم لێبێنە و لە من دوور کەوە و بـە دوای بەختی خۆتدا بڕۆ. شوکر بۆخـوا تـۆ سـاغ و سـلامەتی و مـن نەخۆشـم و خەڵـک بێـزم لێدەکەن، با تۆش خوانەخواستە تووشـی نەخۆشـی نەیـەی و خەڵـکیش نـەزانن کـوڕی کەسێکی وەک منی.

کوڕە دەڵێ: نەخێر بابە گیان ئەوەی مەڵێ، من شانازی بە بوونی تۆوە دەکـەم، بـەس نییە ئەگەر لێیان پرسیم بابت کێیە، دەتوانم تۆیان بە نیشان دەم و شـانازی بـەوە بکـەم کە ڕیشە و ڕەگەزم مەعلوومە!!

❖ قازییەک بـە ڕێگـادا دەڕۆیشـت و یـەکێک بـە دوایـەوە بـوو. لـە ناکـاو قـازی قەڵەمەکەی لێکەوت و کابرا هەڵیگرتەوە و هەرای لێکرد: قوربان قولینگەکەت لێکـەوت، قازی بە تەوەسەوە لێی ڕوانی و کوتی: نەزان ئەوە قەڵەمە یا قولینگە؟ کابرا کوتی: کـارم بەوە نییە قەڵەمە یا قولـینگە، تـەنیا ئـەوەی دەزانم چەنـد سـاڵ لەمەوبـەر بـەو شـتەی حوکمێکی نابەحەقت نووسی و منت پێی خستە زیندان و ماڵوێرانت کردم.

❖ سوارێک بە قەراغ ئاوەدانییەکدا تێپـەڕی، پیرێژنێـک پێشـی پێگـرت وکـوتی: دایە پیرەت بە قوربان بێ، ئەگەر ئاورت پێیە بمدەیە ئاورگەکەمی پێ هەڵدەکەمەوە.

سوار پرسی: بۆ داپیرە دەو ئاوەدانییەدا ئاور وەگیر ناکەوێ داوا لە من دەکەی؟

پیرێژن کوتی: داپیرەت بە قوربان بێ، دەو ئاوەدانییەیدا چی زۆرە ئاور، بەلام من قسە و نێوانم دەگەڵ هیچیان نییە ودەنگم لە هەموویان گۆڕیوە و داوای هیچ شتێکیان لێ ناکەم.

سوار کوتی: مادام هێندە خراپ بی دەو دێیەدا تەنانەت دۆستێکت نەبێ کە داوای ئاوری لێبکەی، وەللاهی منیش ناتدەمێ.

❖ کەسێک لە بزورگمێهری حەکیمی پرسی: دارایی و هەبوونی مالی دنیا باشترە یا زانایی؟ بزورگمێهر کوتی: زانایی.

کابرا کوتی: ئەی بۆ زانایان خزمەتی مالداران دەکەن بەلام مالداران خزمەتی زانایان ناکەن؟

بزورگمێهر کوتی: زانایان بە هوی زانستی خۆیان قەدری مالی دنیا دەزانن و ئەگەر هەیانبێ یا بکەوێتە دەستیان دەزانن دە چ ڕێیەکدا خەرجی کەن، بەلام مالداران بە هوی نەزانی خۆیان قەدری زانایی نازانن و تێناگەن کە چۆن ڕێز و حورمەتی زانایان ڕاگرن.

❖ لە قسەخۆشێکیان پرسی: ژنی ڕەشەسمەری گەنمڕەنگ جوانترە یا ژنی سپی و موو زەرد و چاوشین؟ کوتی: بۆ ئەو کەسەی ژنی ڕەشەسمەری گەنمڕەنگی هەیە ژنی سپی و کاڵ و موززەرد جوانترە، بەلام ئەوەی ژنی موززەردی کاڵی چاوشینی هەیە ژنی ڕەشەسمەری گەنمڕەنگی پێ جوانترە، ئەوەی هیچیانی نییە هەردووکیانی پێ جوانە و ئەوی هەردووکیانی هەیە هیچیانی پێ جوان نین.

❖ لە کابرایەکی زۆر برسی و هیلاکیان پرسی: دوو و دوو دەکاتە چەند؟ کوتی: چوار کوللێرە.

❖ پێشینان کوتوویانە: بۆ ئەوەی خۆشەویست و لەبەردڵان بی تا دەتوانی هیچ شتێک لە کەس داوا مەکە، خراپەی کەس مەڵێ و دەگەڵ کەس خراپەی مەکە.

دیسانیش کوتوویانە: هەرکەس ئەو خوو و ئاکارانەی تێدا بێ بۆ دۆستایەتی دەبێ و پێویستە ڕێزی لێ بگیرێ: ئەگەر عەیبێکی لە کەسێک بەرچاو کەوت لێی لە هەڵلا نەدات، ئەگەر لە لایەن کەسێکەوە چاکەیەکی دەگەڵ کرا ئەو چاکەیە بە زۆر بزانێ و تا دەتوانێ لێی بلێتەوە و باسی بکا.

ئەگەر بۆخۆی چاکەیەکی دەگەڵ کەسێک کرد بە هیچی دانێ و هەرگیز باسی نەکاتەوە، ئەگەر پیاوەتی و چاکەیەکی دەرحەق بە خۆی لە لایەن کەسێکەوە دەگەڵ کرا قەتی لە بیر نەچێتەوە.

ئەگەر یەکێک دە بەرامبەریدا تووشی هەڵەیەک بوو بتوانێ لە بیری بەرێتەوە و لێی خۆش بێ و ئەگەر یەکێک داوای لێبووردنی لێکرد، توانایی لێبووردنی هەبێ و غەرەزی دەدڵی خۆیدا ڕانەگرێ.

ئاکاری دزێو و ناشایست دۆستی دەکا بە دوژمن و ئاکاری باش و بەجێ دوژمنی دەکا بە دۆست، ئەگەر ناتوانی بە ئاکاری باش دوژمنانت بکەیە دۆست، وشیار بە بە ئاکاری هەڵە ونابەجێ دۆستانت نەکەیە دوژمن، نەزانترین کەسان ئەوانەن کە شەرتی دۆستایەتی بەجێ‌ناهێنن و ئەوان لە خۆیان دەتۆرێنن.

❖ زانایەک بە منداڵێکی کوت: ئەگەر بە من بڵێی خوا لە کوێیە سێوێکت دەدەمێ، منداڵەکە کوتی: من دەچمەوە ماڵ دوو سێوت بۆ دێنم ئەگەر بە من بڵێی

خوا لە کوێ نییە؟

❖ خوولە بە کۆلانێکدا ڕادەبرد پێی کەوتە سەر توێلکە شـووتییەک و هەڵخلیسـکا و کەوت، خەنجەری هەلکێشا و توێلکەشووتی وەبەر خەنجـەران‌دا، پێیـان کـوت: پێـت عەیب نییە لەسەر ئەو هەموو ئەقلەت دەگەڵ توێکلەشووتی بە شەڕ دێی؟ کوتی: توێلکـە شووتی منی بە عەرزدا داوە و حەق وایە ڕقی خۆم بەو بڕێژم، دوژمـن دوژمنـە و نابـێ بـە کەمی بگری تەنانەت ئەگەر توێلکە شووتی بێ و بـەر لـەوەی فکـرت بـۆ بکاتـەوە دەبـێ فکری بۆ بکەیەوە.

❖ کابرایەکی نـەخۆش و دەسـکورت و نـەدار ڕۆیشـتە لای دوکتـورێکی ناسـیاو، دوکتورکە چاوی بە سەر و وەزعی کەوت زگی پێی سووتا و جگە لەوەی پوولـی فـەحس و معایەنەی لێ وەرنەگرت، لە گیرفانی خۆشی پوولێکی پێدا و بـە ڕوویـەکی خـۆش بـە ڕێی کرد. دوای چەند ڕۆژ دوکتور لە بازاڕ چـاوی بـە کـابرای نـەخۆش کـەوت، چـاک و چۆنی دەگەڵ کرد و کوتی: شوکر وا دیارە ئەو پوولەی پێم دای دە فریـات هـات، ئـەوڕۆ ڕەنگ و ڕووت زۆر خۆشە!

کابرا کـوتی: ئـەرێوەڵـلا مالـت ئـاوەدان بـێ، بـەو پوولـەی پێـت دام چوومـە لای دوکتورێکی حیسابی.

❖ کابرایەکیان بـۆ کەلانـەخواردن بانگێشـتن کـرد و زۆریـان تـاریفی کەلانـە بـۆ کردبوو. کاتێ مالی خانەخوێ کەلانەیان دەگەڵ دۆشـاوی گـەزۆ بـۆ دانـا و زانی کەلانـە ئەمەیە سەرێکی ڕاوەشاند و جنێـوێکی دا و کـوتی: نانیـان کـردۆ دوو لانـە نێویـان نـاوە کەلانە.

❖ لە دۆستێکی قسەخۆشم بیست: ساڵێک دەوڵەتی تورکیا دوچاری کەسری بوودجە بوو، ئاتاتورک دەستووری دا دەو ساڵەدا هەرکەس پێی خوشە دەتوانێ بێ و خۆی بۆ چوونە حەج نێونووس کا و بچێتە زیارەت، بەلام پێویستە دە پێشدا پوولی پێویستی ئەو سەفەرە دە حیسابی دەوڵەت کا، خەڵک کە بۆ ئەو سەفەرە گرینگە بەریان ئاواڵە کرابوو هروژمیان برد و پارەی پێویستیان دە حسیابی دەوڵەت و خۆیان نێونووس کرد، کاتێ دەوڵەت گیانی هاتەوە بەر و وەختی حەجاج بەڕێکردنێ هاتە، ئاتاتورک دەستوورێکی بەو جۆرەی بلاو کردەوە: لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو خەڵکە لەبەر لەقەبەکەی دەچنە حەج و پێیان خوشە پێیان بڵێن حاجی، خەڵک دەبێ وایان پێ بڵێن، بەداخەوە ئەو ساڵ دەوڵەت تووشی کەسری بوودجە بووە و ئەو پووڵەی ئەو کەسانە دە خەزێنەی دەوڵەتیان کردووە خەرجی زۆر کەم و کۆڕی ولات کراوە. بە پێی دەستووری ئێمە کە خاڵێکی دە قانوونی ولاتدا بۆ دیاری کراوە، ئەو کەسانە لە لایەن دەوڵەتەوە بە حاجی دەناسرێن و دەبێ خەڵکیش بە حاجیان نێو ببەن، ئەوەش ناوەکانیانە کە دە ڕۆژنامەدا لە چاپ دراوە: بەو جورە هەموویان پووڵ و زیارەتەکەیان لە کیس چوو.

❖ ئەگەر شێوە ڕەفتاری بەرئاواڵە و باوی نێوکۆمەڵگای ئەودەور و زەمانەیە دەگەڵ شێوە ڕەفتاری داخراوی نەسلی پێش خۆمان هەڵسەنگێنین بۆمان دەردەکەوێ کە نە هەموو شتەکانی ڕابردوو باش بوون و نە هەموو شتەکانی ئەودەورەیە خراپن. دە ئاکاری کۆمەلایەتیدا ئەگەر ئینسان بتوانێ بە قۆناغی مامناوندی بگات و نەوەک ڕابردوو بەربەست و نەوەک ئێستا بەرئاواڵە بێ دەتوانێ بلێ دەستی بە شێوە ژیانێکی دروست و حیسابی ڕاگەیشتووە.

دەگەڵ چەند دۆستی خۆشەویست و قسەزان دانیشتبووین و باسەکەمان ئەم بابەتە

بـوو. دوای ئـەوەی کـە ڕەخنەیـەکی زۆر لـە بـێ بەنـدوباری و بـێ چـاو و ڕوویـی بەعزەکەسانێکی ئەوڕۆیی گیرا، سـەید عومـەر گـوتی: بـابم گێڕایـەوە جەماعـەتێک لـە سەیدەکان لە دێی گوڵیار لە ماڵێک میوان بـوون دە گەرمـەی قسـاندا لـە ناکـاو کـوڕی جحێڵی یەکێک لەو سەیدانە کە حەز ناکەم ناوی بێنم دە کاتی چاخواردنـەوەدا، بایـەکی لێبۆوە، بابی لە ناڕەحەتییان سەری بەرداوە و کوڕە لە شەرمان لە وەتاغەکە ڕۆیشـتە دەر، ئەوانەی دانیشتبوون ویسـتیان باسـەکـە بگـۆڕن یـەکیان گـوتی: دەی گـوێ مـەدەنێ شتێکی هێندە سەیر نەقەوماوە، بابی کوڕە ئاخێکی هەڵکێشا و گـوتی: ڕاسـت دەکـەی، سەیر نا بەڵام شتێکی زۆر گەورە قەوماوە چونکی ئەو کـوڕە ئەگـەر کـوڕی مـن بـێ بـەو شتەی لێی قەوما ئێستا لە شەرمان مردووە و دڵی تۆقیوە. لە بیستنی ئەو قسـەیە دڵـیان کەوتە وەسوەسە هەستان چوونە دیوەکەی دیکـە دیتیـان بەڕاسـتی کوڕەکـە مـردووە و گیانی دەبەردا نەماوە.

دوای گێڕانەوەی ئەو نەقڵە سەید جەعفەر گوتی: ئەو دێیـەی باسـت کـرد دوسـتێکم هەیە بابی ئەو دوستەم لە شتێک ناڕەحـەت ببـوو لـە باسـی حـەیا و حورمـەتی قـەدیم گێڕایەوە: جحێڵ بووم هـەوەڵ مندالـم کچێـک بـوو زۆرم خـۆش دەویسـت بـەڵام لـە بەرامبەر بابمدا هەرگیز نەمتوانی ئەو خۆشەویستییەم بە منالەکەم ئاشکرا کـەم، خەڵـکی ئەو زەمانی لە ڕوویان هەڵنەدەهات لە لای بابیان منداڵیان ماچ کـەن یـا دەسـتێکی بـە سەردا بێنن. لە ناکاو کچەکەم نەخۆش کەوت و ڕۆژ بـە ڕۆژ یـاو و تـاو دایـدەگرت. شـار دوکتوری هەبوو هەرچی کردم و کراندم لە ڕووم هەڵنەهات کە بـە بـابم بڵـێم کچەکـەم نەخۆشە و دەیبەمە لای دوکتور، پێم وابوو ئەگەر ئـەو قسـەیە بکـەم بـێحورمەتییـەکی گەورەم بە بابم کردووە. شەوێک بابم گوتی سبەینێ بۆ فلانەکاری بـڕۆ فلانـە دێـی ئـەو شەوە کچەکەم یەکجار نەخۆش بوو و لـەوەی دڵـنیا بـووم کـە دەمـرێ، هـەرچیم کـرد نەمتوانی بڵێم ناچم کچەکەم دەمـرێ، بـەیانی زوو هەسـتام چوومـە ئـەو دێیـە و کـار و

ویستەکەی بابم ڕاپەڕاند و ئێواریّ گەڕامەوە دوور و نزیکی دیّ بوومەوە دیتم خەڵک لە سەر قەبرانن، زانیم کەوا خەریکی ناشتنی کچەکەی منن هەرچەند لە تاوان دڵم دەتکوت سندە گلێکیان تێناوە و ڕێکی دەگووشن بەڵام هەرچیم کرد لە ڕووم هەڵنەهات یەکڕاست بچمە گۆڕستان، چونکی بە پێی ڕاگرتنی حورمەتی بابم دەبوایە دە پێش هەموو شتێکدا بچمەوە ماڵ و ئەو لە ئەنجامی سەفەرەکەم ئاگادار کەم و ئەگەر پێویست بیّ هەواڵی کۆچی دوایی کچەکەم لە ماڵیّ ببیسم. (ئەوە تابلۆیەکە لە شێوەژیانی ڕابردوومان کە بە دڵنیایی بە کاری فیلمسازانمان دیّ).

## پاشکۆ

خوێنەری بەڕێز، وا کووپەی یەکەم لە خەزێنەی بزەمان هەرچۆنێک بوو بە چاپ گەیاند و خستمانە بەر سەرنجی ئێوەی هێژا و شارەزا. هەروەک دە پێشکۆدا ئاماژەم پێکردووە دەو بەرگەدا هەولم داوە خۆ لە چاپی ئەو نەقلانەی کە ڕەنگە هێندێک کەس پێی هەلبەزنەوە ببوێرم و ماقوولانە کردوومەتە پێشەنگی بەشەکانی دیکە، نزیک بە چل‌ساله به ئەهوەنی و ئارامی قۆلم بۆ کۆکردنەوەی ئەو نەقل و نەزیلانە هەلمالیوە، دەو ماوەیەدا بۆم دەرکەوتووە کە قسە و مەتەلی کوردەواری زۆربەیان بێ‌تویکل و بە واتەی خەلکی ئەو دەور و زەمانەیە ڕووت و بێ‌پەردەن؛ ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر چۆنیەتی فەرهەنگی تایبەت بەو خەلکە و هیچی دەگەل ناکرێ و ئەو جۆرە قسانەش بەشێک لە فەرهەنگەکەمانن. دۆستێکم کوتی: برادەرێکم لە ولاتی هولەند دەزانی ئەنجامدانی چ کارێکیان پێ سپاردووە؟ کوتم بە چی‌ڕا بزانم، کوتی: ماوەیەکە لە زمانەکەیان سەرڕاست و شارەزا بووە، دەلێ: لەو ولاتە شتێک بە نێوی جنێو نەماوە ئێستا پێیان سپاردووە بچێ شاربەشار بە نێو پیرەکاندا بگەڕێ و بە هەر جۆرێک بێ ئەو جنێوانەی کە دە ڕابردوودا پێکتریان داوە لە زمانیان دەرکێشێ و ئەو بیان‌نووسێتەوە و بیانباتە ناوەندی تەحقیقات و لێکۆلینەوە تا دە ئاڕشیوی فەرهەنگییاندا بمێننەوە.

ڕۆحی شاد بێ مامۆستا عەلائەددین سەججادی ڕێشمەی لەسەر ئەسپی ویستی دامالیوە و چی دەڕاوی قەلەمی کەوتووە نووسیویەتی و بە چاپی گەیاندووە، بەلام من لەمێژە دەگەل خۆم ململانەی ئەوەمە کە ئایا بەرگەکانی دیکەی ئەوکتێبە هەر بە شێوەی کووپەی یەکەم تەتەلە و بژار کەم یا ڕشتەی مرواریيانە پێدا دەم و هیچیان لە

قەڵەم نەخەم؟ دیارە داهاتوو و ویستی خوێنەرانی بەڕێز ئەو وڵامەم دەدەنەوە و تا ئەو کاتی یا عومر!

یادی بەخێر ساڵی ٦٠ بوو بە خزمەت مامۆستا هەژار گەیشتم خەریکی فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە بوو. بە تاقەفەردە ئەرکی کۆڕ و ئەنجومەنێکی وەستۆ گرتبوو. فەرمووی ئەو کارەی من دەستم داوەتێ دەتوانایی تاکەکەسێکدا نییە و دەئەنجامدا بێ کەموکووڕی نابێ. هەرواشبوو؛ دوای کۆچی دوایی ئەو کەڵەمێرە کەسانێکی حازرخۆری بەر سێبەر و کارنەکەر و تەنانەت چەنەوەڕ شەکریان لە دوای شکاند و دایانە بەر ڕەخنە و ئۆخژنیان خستەدڵی ڕەش و حەسوودیان.

نووسەری کورد بێپشتیوانە و ئەوەی دەیکا و دەینووسێ و ئەو شەو نخونیانەی کە دە پێناو بەرهەمهێنانی کتێبێک دەیکێشێ تەنیا و تەنیا بۆ دامرکاندنی ویستی دەروونیەتی کە لای وایە وەک ئەرکێک بەرامبەر بە فەرهەنگی گەلەکەی بەستۆوەیەتی و چاوی لە ئافەرین و بارەقەڵلا و دەسخۆشانەی کەس نییە و ئەوەی دەیکا بۆ دڵی خۆی دەیکا و منەت لە سەر شانی کەس دانانێ.

تا ئێرەی کار ئەرکی شاعیران و نووسەرانمان بوو وەباڵ بەئەستۆم دمو پەڕی لە خۆبوردەییدا بە جێیان گەیاندووە و ژیان و گەنجی تەمەنیان لە سەر داناوە، بەڵام کاتێ کتێب و نووسراوە ئامادە بوو، ئەرکی لە چاپدان و بڵاوکردنەوەیان لەستۆی کەسانێکی دیکەیە کە بە داخەوە لۆکەیان دە گوێی خۆیان ئاخنیوە و کەمتەرخەمییان گەیاندووەتە ئەوپەڕی خۆی. فەرهەنگ دۆستی و فەرهەنگپەروەری، دوو شتی لێکجیاوازن؛ ئێمە دە درێژەی شەو و ڕۆژدا ئەگەر ڕاستەوخۆش ڕوو دە کتێب و خوێندنەوە و ئەو بەرەو بەر نەکەین بێگومان چەند سەعاتێک چاو لە تلەویزیۆن دەکەین یا گوێ لە ڕادیۆ و مۆسیقا ڕادەگرین و بێئەوەی بزانین دە دنیای فەرهەنگدۆستیدا چەند کاتێک لە ساتەکانی شەو و ڕۆژ دەگوزەرێنین و بێگومان هەموومان دەبێ خۆمان بە قەرزداری کەسانی

هونەرمەند بزانین کە بە بوونی خۆیان و هونەرەکەیان بۆ شاییەکی گەورەی ڕووحی و ڕەوانیمان بێهیچ چاوەڕوانییەک بۆ پڕ دەکەنەوە.

ئەگەر هونەرمەند بەرامبەر هونەرخواز ئەرکی لە سەر شانە و دەبێ وشیار بێ هەموو گەندە و مەندەیەکی بە نێوی هونەر پێشکەش نەکا هونەر خوازیش ئەرکی تایبەتی لەسەر شانە و دەبێ لە قۆناغی هونەردۆستیڕا بەرەو قۆناغی هونەرپەروەری هەنگاو هەڵێنێتەوە، چەپڵە بۆ لێدان و تاریف و بە باڵای شاعیر و نووسەردا هەڵگوتن، هیچ بارێک لە هونەرمەند کەم ناکاتەوە، دنیای دروشم و شوعار بەسەر چووە و زەمانی کردەوە و هاتنە مەیدانە. دەیان شاعیر و نووسەری زۆر لە ئێمە سەرتر بە هۆی ئەوەی هیچ پشتیوانییەکی مالییان نەبووە یا دەیان دەنگخۆش کە بە هۆی بێپاڵپشتی دەستیان بە شوێنی تۆمار کردن ڕانەگەیشتووە، بەرهەمەکانیان هاوکات دەگەڵ مردنی خۆیان لە ناو چووە.

قسە بۆ کوتن زۆرە بەڵام لە قەست دەیاندەمە بەر مقەست و لەوە زیاتر درێژ دادڕی ناکەم و چاوەڕێ دەمێنم تا بزانم کەنگێ هەستی نووستووی ئەو کەسانەی کە بەڕاستی ئەرکی زۆر قورسیان دەوبارەیەدا لە سەر شانە و خۆیان لە بواری بێخەبەری داوە وەخەبەر دێ! (هەر ئەوەندەی دەڵێم: بۆ ئاقڵان ئیشارەیەک بەسە).

ڕەنگە چەند کتێب لە نووسەرێک دە ڕۆژێکدا لە چاپ بێنە دەر بەڵام بە دڵنیایی بە ڕۆژێک نەنووسراون و تا ئامادە بوون ڕەنج و زەحمەتی زۆریان دە پێناودا کێشراوە. خەزێنەی بزەش بەرهەمی دەیان ساڵ گوێ هەڵخستن و قسە و نوکتە بیستنە و بە شێوەی زنجیرە و دە چەند بەرگدا بە چاپ دەگا و مەیدانتان بۆ دەوڵەمەندترکردنی بەرگەکانی دیکەی ئاوالەیە و نامەوێ ئەسپی خۆم بە تەنیایی تاو دەم و بابەتی بەعزە ناوچەیەک لە قەڵەم خەم، هەر بۆیە ئەگەر بابەتی تازەم دەست کەوێ بەو مەرجەی پێشتر نەمنووسیبنەوە، یا لە هیچ شوێنێک لە چاپ نەدرابن دەو پەڕی ئەمانەتداریدا دە

بەرگەکانی دیکەدا بە ناوی خاوەنیان دەیانگونجێنم.

ئاواتەخوازی گەیشتن بە ئامانجە پیرۆزەکانتان

ڕەسووڵ ڕەشئەحمەدی (هەڵۆەدا)

١/ ٤/ ١٣٨١ مەهاباد

# فەرهەنگۆکی زاراوە بۆ ئەم کتێبە

**ئاراموقاراو**: ویسحەت و ئاسایش

**ئالاوان**: ئالاواندییەکە لەوبەری چۆمی زێیە بەرامبەری میرلوەی سەردەشتە؛ ئالاوە.

**ئاورگ**: ئاگردان

**ئولوهی**: وەڵلاهی؛ وەڵلا؛ بەوەڵلا.

**ئەوانەجالان**: ئەو وەختانە

**بەرناوێ**: منالی لە بەر نەچێ؛ زیاتر بۆ ئاژەڵی ئاوس و دوو گیان دە کار دەبرێ

**بوک**: وەوی

**بە هەموو دەمایەخۆی**: بە هەموو هێزی خۆی

**بەرسوورکە**: سوسک؛ جۆرێک قالۆچەیە و زیاتر دە ئاومرۆ و شوێنی پیس دادەژی و نیشانەی پیسی و چەپەڵی شوێنێکە.

**بیهەت**: عەیب و ناجەیاز؛ بیلحەت؛ کردەوەی بلحانە

**پاستاو**: ئەو کۆگا گلەسوورەی ئاویلندە باڵ کردووە تا بە قوڕ بیگرنەوە؛ وشەی تایبەتی کورەخانەیە

**پێودار**: ئەو کەسەی کار و پیشەی کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵە

**پەلەسوانە**: ئەو دارە زیادیانەی دە کاتی دارەڕاکردن لە دیوار تێدەپەڕن و دیواری لە تەڕ و تووشی دەپارێزن؛ بە زمانی ئەورووپی قونیس

**پەیاخ**: کوتەک و داردەستی تایبەتی لێدان

**پێشم هەڵدێ**: دیق دەکەم

**تەرخ**: تەرک

**تیلەکەیک**: کۆڵێک

**تەماڵ**: ڕاو؛ ئەو دەعبایەی بە خشپەی پێی ڕاوچیان لە لان و حەشارگە دەردەپەڕێ بەتایبەت کەروێشک

**تینتینۆکە**: گەرو و مل و ڕێگای نەفەس و هەناسە هەڵکێشان

**جاڕز**: بێزار

**چەقەسوو**: چەقەساو؛ خراپ تیژ کردنەوە

**چل و مل**: جۆرێک وشەیە بۆ مانای موزاحیم

**حۆقە**: پێوەری ئەندازەگرتن

**دۆستەوا**: دۆست و لایەنگر

**دەتلاتێ**: پێت دەدا

**دەنگ لێ گۆڕین**: بە هۆی توڕان قسە دەگەڵ کەسێک نەکردن

**دە شێلەییدا**: دە ئارامیدا؛ دە بێدڵەڕاوکەییدا

**دمەڕێ**: توڕە و عەسەبانی؛ لە کورە دەرچوو

**ڕەبەن**: سەڵت؛ بێ ماڵ و حاڵ و ژن و منداڵ

**زەواد**: ئەو دانەوێڵانەی کە مایەی ژیان و بەڕێچوونن بەتایبەت گەنم و جۆ و هەرزن کە نانیان لێ ساز دەبێ.

**ژنم ناکەن**: ژن، شووم پێ ناکەن

**سۆستان**: ئاواییەکی خۆشئاو و هەوای نزیک گوندی ئالاوانە

**سورمە**: ئەو کۆگا گلەسورەی کە دەیانەوێ بۆ خشتپێژان بە

قور بیگرنەوە

**سەری ئەنگۆ:** سەری ئەنگۆ؛ سەری ئێوە

**سەوڵە:** نانی تایبەت بۆ خۆراکی سەگ کە بە شێوەی ئانگوتکی و خەپلە ساز دەکرێ

**شێنەیی:** ئارامی؛ بێ پەلەکردن

**شێنیە:** کاتێ لە دوڵەتوێ بەرەو عیراق دەچی یەکەم دێی عیراقە ئەو دێیە دەورانی سەدام وێران نەکراوە و وەک خۆی ماوە.

**عەلامەت:** سەیر

**عەلەم:** ژان و ئێش و ئازار و نەخۆشی

**قالیانتاغ:** شوێنێکە لە نێوان میاندوواو و مەهاباد

**قامچی:** شەلاق؛ قمچی

**قامک:** ئەنگوست

**کانەم:** دێیەکی خۆش ئاو و هەوای مەهابادە لە اوێنی کێوی جەواڵەرەشان بەروکاری مەهاباد لە سەرڕێی مەهاباد سەردەشتە

**کەتن:** بەلا؛ مقەددەر؛ ڕووداوی ناخۆش

**کوێزرکوت:** لێدانێکی توندی بێبەزەییانە؛ ئەو کوتانەی کە توێکڵی لە دان جیا دەکاتەوە

**کوڕتاندرو:** کۆپاندرو

**کەوڵ:** سفرەی قەدیم کە لە کەوڵی ئاژەڵ بە شێوەی کوت کوت و جوان و نەخشا و ساز دەکرا.

**گای دەبەر نیرینا مرد:** گایەکەی دە کاتی زەوی کێلاندا پسا و لە ماندووی و شەکەتیان مرد.

**گەورک:** عیل و عەشیرە و تایفەیەکی گەورە و بەربلاون دە نێوانی مەهاباد و سەردەشت و بانە و سەقزدا

**گلۆم:** کۆبوونەوەی جەماوەر

**گوێچکە دەرێ:** دێیەکە لە نێوان مەهاباد و سەردەشت لە سەر ئابلۆ ناوەکەیان کردووە بە کوشک دەرێ

**گوڵ:** جوزامی

**گەڕاو:** دێیەکە نزیک شالاوە و سۆتان بەرامبەری میرلوێ لەوبەری چۆمی زێیە هەڵکەوتووە

**گەردن ئازا کردن:** گەردنئازاکردن؛ لێخۆش بوون؛ عەفوو کردن

**لێکدالێکدا:** پەیتاپەیتا؛ بەردەوام

**ماڵێکم هەڵدەنا:** ماڵێکم دە نەزمر دەگرت

**مافوور:** فەرش؛ ئەو ڕاخەرەی کە لە خوری تەندرابێ

**مڕ بوون:** تەواو تێر بوون

**مەشی دەکاتەوە:** لە ناوی دەبا

**نایەنە ئەگری:** لێی نادەی

**نێوکەکەوتوو:** ناوک کەوتوو

**نقورچ:** مشتەکۆڵە

**نیوەرێ:** نیوەڕۆ

**واوان:** دێیەکی زۆر خۆش ئاو و هەوایە لە سەر ڕێی سەردەشت میرلوێ هەڵکەوتووە.

**ویسعەت:** ویسعەت؛ ئیسراحەت؛ ئارامیش

**هەرای دەکاتێ:** غاری دەداتێ؛ شاڵاوی بۆ دەبا

